خولی شەشەم






# خولی شەشەمی پێشبڕکێی

# کەناڵی بەکورتی



## تایبەت بە خوشکان









١٤٤٥ هجری

٢٠٢٣ میلادی





# خولی شەشەمی پێشبڕکێی

# کەناڵی بەکورتی

## تایبەتە بە خوشکان

خوشک و برایانی بەڕێز : گەر هاوکارمان بن ئەوا إن شاء الله هەموو مانگێک خولی نوێ ڕادەگەیەنین بۆ زیاتر شارەزاکردنی ئێوەی بەڕێز لە حوکمە شەرعییەکان و بۆ هەر خولێک تەنها پێویستمان بە (٣٠٠) هەزار دینارە بۆ خەڵاتەکان ، جا هەر بەڕێزێک پێی خۆشە بەگوێرەی توانای خۆی بەشدار بێت و هاوکارمان بێت لە دابینکردنی خەڵاتەکان دەتوانێت لەڕێگەی (Fast Pay) هاوکاری خۆی بنێرێت.



FastPay

07501232360

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**خوشک و برایانی بەڕێز** : کەناڵی (**بەکورتی**) لە تلیگرام تایبەتە بە بڵاوکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان بەکورتی و پوختی ، سوپاس بۆ خوای گەورە لە ماوەی ساڵێکدا زیاتر (٣٥٠) بابەت و حوکمی شەرعی گرنگی تێدا بڵاو کراوەتەوە و ڕۆژانەش بەردەوامە لە بڵاوکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان ، وە لە ئێستادا زیاتر لە (**١٢٠٠٠**) یانزە هەزار لە خوشک و برایانمان هاوڕێمانن لەم کەناڵە گرنگە .

جا بۆ سوودی زیاتر ماوە ماوە وەکو ستافی کەناڵ پێشبڕکێیەک ساز دەکەین بۆ ئەندامانی بەڕێزمان و بە گوێرەی توانا چەند خەڵات و دیاریەکیش ئامادە دەکەین بۆ سەرکەوتووان .

جێگای خۆشحاڵییە کە لە پێشبڕکێی یەکەم تا پێنجەم زیاتر لە (٧٠٠٠) حەوت هەزار کەس بەشدار بوو و زیاتر لە ٨٥ کەس خەڵاتیان بۆ دەرچوو.

**ئێستاش پێشبڕکێی خولی شەشەم ڕادەگەیەنین بەم شێوەیە :**

١. تەنها ئەم کتێبەی بەردەستت داخلە بۆ تاقی کردنەوەکە و پێویستە بیخوێنیتەوە کە کۆمەڵێک بابەتی گرنگی کەناڵی بەکورتی یە.

٢. لەم کتێبە (٢٠) پرسیارمان دەرهێناوە بە شێوەی هەڵبژاردن و ڕاست و هەڵە ئاڕاستەتان دەکرێ بە شێوەی ئۆنلاین.

٣. تاقی کردنەوەکە لەسەر (١٠٠) نمرەیە بەم شێوەیە :

أ. (٦٠)نمرە بۆ پرسیارەکان واتە هەر پرسیارێک سێ نمرەی لەسەرە.

ب. (٢٥) نمرەش بۆ ئەو بەڕێزەیە کە ئەم کتێبە هەمووی دەخوێنێتەوە.

ج. (١٥) نمرەش بۆ ئەو بەڕێزەیە کە لینکی کەناڵی (بەکورتی) دەنێرێ بۆ پێنج لە هاوڕێکانی ، یان پێنج هاوڕێی ئاگادار دەکاتەوە لەم پێشبڕکێ یە.

واتە : گەر ئەم کتێبە بخوێنیتەوە و بینێری بۆ پێنج لە هاوڕێکانت و ئاگاداریان بکەیتەوە لەم پێشبڕکێ یە ئەوا (٤٠) نمرەت مسۆگەرە .

چونکە پرسیاری یەکەم و دووەم لەسەر ئەوەیە ئایا کتێبەکەت خوێندۆتەوە و هاوڕێکانت ئاگادار کردۆتەوە لەم پێشبڕکێ یە؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێ بوو ئەوا (٤٠) نمرە وەردەگری لە ڕۆژی تاقیکردنەوەکە ، ئێمەش متمانەمان بە هەموتان هەیە کە ئەم دو خاڵە جێبەجێ دەکەن.

٤. کاتی دەست پێکردنی تاقیکردنەوەکە ڕۆژی (٢٠٢٣/١٠/١) دوای نوێژی عەسر دەبێت و بۆ ماوەی (سێ ڕۆژ) فۆرمەکە داناخرێت،و بەشێوەی ئۆنلاین دەکرێت إن شاء الله.

٥. لەکاتی تاقیکردنەوەکە نابێت سەیری کتێبەکە بکرێت چونکە پرسیارەکان ئاسانن .

٦. دەقی ئایەت و فەرمودەکان داخل نیە بۆ تاقیکردنەوەکە .

٧. خەڵاتەکان (١٠) دانەیە ، پێنج عابا و سەرپۆش لەگەڵ کۆمەڵە کتێبێکی بەسوود. هەر بەڕێزێکیش پێی خۆشە بەشدار بێت لە دابینکردنی خەڵاتەکان دەتوانێت پەیوەندیمان پێوە بکات بۆ ئەوەی بتوانین خەڵاتی زیاتر دابین بکەین.

ئامانج لەم پێشبڕکێیە تەنها بردنەوەی خەڵات نیە بەڵکو بۆ زیاتر تێگەشتن و شارەزابوونە لە حوکمە شەرعییەکان کە ئەمەش باشترین خەڵات و دیارییە .

وە ئەوەش بزانە کە بەردەوامی تۆی بەڕێز لەگەڵ ئەم کەناڵە بەسوودە زیاتر شارەزات دەکات لە دینەکەی خوای پەروەردەگار و مژدەشت لێ بێ کە : پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: « مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ » واتە: ئەگەر خوا خەیر وچاکەی بۆ کەسێك بوێت، ئەوا شارەزای دەکات لە ئاینی ئیسلام.

وە (أبو الدَّرداء) خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ بەدەست هێنانی زانستی شەرعی، ئەوا خوای گەورە بەو کارەی ڕێگایەکی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات. جا بەشداری کردن لەم جۆرە پێشبڕکێ یە بە نیەتی فێربونی زانستی شەرعی و شارەزابوون لە دینەکەت إن شاء الله دەبێتە هۆی ئاسانی ڕێگای بەهەشت .

هاوڕێکانتان ئاگادار بکەنەوە با هەمووان سودمەند بن بارک الله فیکم .

## سود و حیکمەتی فەرزکردنی حیجاب لەسەر ئافرەتان

خوای پەروەردگار حیجابی لەبەر چەند حیکمەتێکی گەورە فەرز کردووە ، وچەندان نهێنی و ئامانجی گەورەی لەپشتەوەیە لەوانە :

یەکەم : پاراستی ناموس .

دووەم: پاراستنی پاکی دڵ .

سێیەم : ئاکار وڕەوشتی بەرز وپەسەند.

چوارەم : نیشانەی داوێن پاکی یە .

پێنجەم : ڕێگرە لەبەردەم تەماح وچاوی خراپەکاراندا .

شەشەم : پاراستنی شەرم و حەیا .

حەوتەم : حیجاب ڕێگرە لەبەردەم بڵاو بوونەوەی سفوری وتێکەڵی پیاوان وئافرەتان لەوڵاتانی ئیسلامی دا .

هەشتەم : حیجاب پارێزەرە لەکەوتنە نێو زینا وخراپەکاریەوە ، وئافرەت دەپارێزێت لەوەی ببێتە کاڵایەکی هەرزان بەدەستی کەسانی هەرزە وئارەزوو بازەوە.

نۆیەم : ئافرەت خۆی لەخۆیدا عەورەتە ، حیجاب داپۆشەریەتی ، وئەوەش جۆرێکە لەتەقوا ولەخوا ترسان.

دەیەم : پاراستنی غیرەت و پیاوەتی وشەهامەت .

## حوکمی نەشتەرگەری جوانکاری لوت و سنگ

نەشتەرگەری جوانکاری دوو جۆرە :

جۆری یەکەم : نەشتەرگەری جوانکاری کە زەرور بێت ، بۆ لابردنی عەیبێکە بەهۆی حادیسە و ڕووداوێکەوە دروست بووە ، ئا ئەم جۆرەیان دروستە وهیچی تێدا نی یە، چونکە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - ڕێگەیدا بەو پیاوەی کە بەشێك لە لوتی لە جەنگدا بڕابوو، بە ئاڵتون بۆی دروست بکرێتەوە.

جۆری دووەم : جوانکارییەکی زیادەیە ئەمەیان بۆ لابردنی عەیب نی یە بەڵکو بۆ زیاتر جوانییە ، وەک جوان کردنی لوت بەبچووک کردنەوە ، یاخود جوان کاری لەسنگدا جا بەگەورە کردنی بێت یاخود بچووک کردنەوەی .

ئا ئەم جۆرە لەنەشتەرگەریە هیچ زەرورەتێکی تێدا نی یە ، بەڵکو تەنها گۆڕینی دروست کراوەکانی خودایە ، وگاڵتە کردنە پێی بەپێی هەواو وئارەزووی خەڵک ، جا ئەم جۆرەیان حەرامە و دروست نییە ، کەجێگەی داخە زۆرێک لەخەڵکی و بەتایبەتی ئافرەتان کاتێک نەشتەرگەری جوانکاری دەکەن لەم جۆرەیە نەک جۆری یەکەم.

## خوشکی بەڕێز

### پێش ئەوەی بڕۆیتە بازاڕ ئاگاداری ئەم خاڵانە بە :

١- بزانە بازاڕەکان خراپترین شوێنی زەوین بەلای خوای گەورەوە ، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : خۆشەویستترین شوێن وجێگا بەلای خواوە مزگەوتەکانەو بێزراوترین شوێنیش بازاڕەکانە.

٢- پابەندبە بە حیجابی ئیسلامی (عابا) و بەڕێزو سەنگینیەوە بچۆرە ناو بازاڕەوە ، و بۆن و عەتر لە خۆت نەدەی .

٣- ئەو شت ومەکانەی کە دەتەوێت دیاری بکە پێش چوونە بازاڕت، وە ئەگەر تەواویش بوویت لە کڕینی ئەو شتانە بەبێ دواکەوتن بگەڕێوەماڵەوە.

٤- ووریابە لەگەڵ بەسەربردن وبەفیڕۆچوونی کاتەکانت لە بازاڕدا.

٥- خۆت بەتەنها هەرگیز مەچۆ بۆ بازاڕ،.

٦- هەرگیز لەگەڵ شۆفێرێکی نامەحرەم بەتەنها سواری ئۆتۆمبیل مەبە چونکە ئەوە بەتەنها کەوتنی حەرامە .

٧- سووربە لەسەر خوێندنی دوعای بازاڕ .

٨- چاوتیش داخە لەئاست پیاوی نامەحرەم .

٩- زۆر وووریابە لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ فرۆشیارانداو بەلەنــجەو نەرمیەوە قسە مەکە، وە زۆر بەلای چەپ وڕاستتدا لا مەکەرەوە

١٠- قسە درێژمەکەرەوەو بابەت مەکەرەوە لەگەڵ فرۆشیارەکاندا.

١١- هەرگیز بەتەنها نەکەویت لەگەڵ دوکاندارو فرۆشیارەکاندا لە دووکان وجێگای مەخزەن وشوێنی تر، چونکە ئافرەتی بڕوادار خۆی دەپارێزێت لە شوێنی گوماناوی چ جای شوێنێکی حەرام، کەبە دڵنیاییەوە بەرەو حەرامیش دەتبات.

١٢- شتی زیاد لە پێویستیش مەکڕە، چونکە ئیسرافەو نیشانەی پشتگوێ خستنی نیعمەتی خوای گەورەیەو لەکاروکردەوەی شەیتانەکانە.

١٣- شوێنی داب ونەریت وشتی مۆدێرن وتازەباوی ناشیاوو نادروست مەکەوە، چونکە ئافرەتی موسڵمان تایبەتمەندی خۆی هەیە.

١٤- ببە بەسەرمەشق و مامۆستایەکی چاولێکار بۆ دەوروبەرت و خوشکانت لە قسەوگوفتارو ڕێکردن و دیمەن و هەڵسوکەوتت.

١٥- ئەگەر کەلو پەلێکی ماڵت پێویست بوو ئەوا دەتوانی بە مێردەکەت یا براکەت یان باوکت بڵێی و مەرج نیە بۆ هەموو شتێکی بچووك سەردانی بازاڕ بکەیت ئیللا مەگەر شتانێك نەبێت کە تایبەت بێت بە ئافرەتانەوەو ئەوان نەتوانن یان نەزانن بۆت بکڕن وەکو جلو بەرگ و....

خوای گەورە بتپارێزێت



## ئافرەتان و وەرزش

چ کاتێک دروستە ئافرەت بچێت بۆ ئەو هۆڵ و شوێنانەی کە تایبەتن بە وەرزش کردنی ئافرەتان؟

شاراوە نی یە کە وەرزش کردن چەند قازانجێکی تەندروستی ، ودەرونی هەیە ، بەڵام لەبەر ئەوەی وەرزش لەم سەردەمەدا شێوەیەکی تایبەتی هەیە پێویستە چەند زەوابیتێکی شەرعی بۆ دابنرێت ، جا هەرکەسێک ڕەچاویان بکات ئەوا وەرزشەکەی دروستە و موباحە ، و بەپێچەوانەشەوە هەرکەسێک ڕەچاوی ئەو مەرجانە نەکات ئەوا وەرزشەکەی دروست نی یە و حەڕامە ، وهەندێ لەو مەرج و زەوابیتانە :

**یەکەم**: پێویستە ئەو وەرزش کردنە دوور بێت لەچاوی پیاوان ، جا جیاوازی نی یە ئەو پیاوانە ڕاهێنەر بن یاخود مامۆستا ، یاخود قوتابی ، یاخود بینەر.

هەر بۆیە باشتر ، وچاکتر ، وگونجاو تر ئەوەیە ئافرەت لەماڵی خۆیدا وەرزش بکات ، نەک قاعە هەر چەندە لەو جێگایانەدا تێکەڵی پیاوان نەبن ؛ چونکە ئەمین نی یە لەوەی کەسێکی خراپ تەسویری بکات و توشی شتێک بێت کەسەرەنجامەکەی باش نەبێت .

**دووەم** : لەکاتی وەرزش کردندا جلێکی داپۆشەر لەبەر بکات ، دروست نی یە بۆ ئافرەت ، وئەوانەی لەگەڵی یاری دەکەن جلی کورت و تەنک و تەسک لەبەر بکەن.

سێیەم: ئەم یاریانە لەچەند کاتێکی کەم و دیاری کراودا ئەنجام بدرێن ، نابێت ببێتە هۆی ئەوەی ئافرەت واجبە دینی و دونیاییەکانی فەرامۆش بکات .

**چوارەم** : هەڵنەکردنی مۆسیقا لەکاتی ڕاهێنان و یاری کردندا .

**پێنجەم** :خۆ نەشوبهاندن بەپیاوەڕان لەجل و بەرگ و هەڵسوکەوتدا.

**جا ئەگەر ئەم مەرجانە هاتنە جێ :**

ئەوا دروستە ئافرەتان وەرزش بکەن ، هەر چەندە ئێمە ئامۆژگاری ئافرەتان دەکەین خۆیان بپارێزن ، ئاگاداری کاتەکانیان بن ، لەم جۆرە شتانەدا بەفیڕۆی نەدەن .

**وە ئەو شوێنانەی کە ئێستا هەیە بۆ وەرزش کردنی ئافرەتان خاڵی نین لە تاوان و سەرپێچی بۆیە کە توشی تاوان و خراپە هات ئەوکاتە نابێ سەردانی ئەو شوێنانە بکات و دەتوانێت لە ماڵەوە وەرزش بکات ئەمەش بۆ پاراستنی خۆی و ئیمانەکەی .**



## خوێنەکانی لەشی ئافرەت و حوکمەکانیان

**یەکەم : خوێنی سوڕی مانگانە (الحیض)**

خوێنێکی ئاساییە لەئافرەتانەوە دەردەچێت لەحاڵەتی تەندروستدا بەبێ هۆکاری منداڵ بوون یاخود خوێن بەربوون.

١ - ئەو شتانەی کە بەهۆی خوێنی سوڕی مانگانەوە حەڕام دەبێت :

ـ جیماع کردن .

ـ نوێژ کردن .

ـ تەواف کردن وسوڕ خواردنەوە بەدەوری کەعبەدا .

ـ دەس دان لە قورئان .

ـ تەڵاق دان .

ـ ڕۆژوو گرتن .

ـ مانەوە لەمزگەوتدا .

٢- ئەو شتەی کە دروستە لەحاڵەتی سوڕی مانگانەدا لەگەڵ ئافرەتدا بکرێت:

ـ یاری ودەستبازی و ماچ کردن و چێژ وەرگرتنی پیاو لە خێزانی بەبێ ئەوەی جیماعی لەگەڵ بکات .

ـ یەکتر ڕەحەت کردن. واتە ئافرەت بە دەستی مێردی ڕەحەت بکات ، وە پیاویش بەهەمان شێوە بۆ خێزانەکەی .

٣- ئەو شتانەی کەواجب دەبێت لەحاڵەتی تەواو بوونی سوڕی مانگانەدا :

ـ خۆ شوشتن .

ـ قەزا کردنەوەی ڕۆژوو .

**دوو تێبینی :**

١- لە کاتی یەکەم توش بوونی کچان بە سوڕی مانگانە ئەوە نیشانەی باڵغ بوونێتی.

٢- لە دوای پاک بوونەوەی ئافرەت لە عادە لێڵایی و زەردایی حسابی بۆ ناکرێ و بەردەوام دەبێ لە نوێژ و ڕۆژوو گرتنی خۆی .

**دووەم : خوێنی « زەیستانی»**

پێناسەکەی:

خوێنی زەیستانی: بریتیە لەو خوێنەی کە لە شوێنی منداڵبوونی ئافرەتەوە دەردەچێت بەهۆی منداڵ بوونەوە، ئەگەر لەبارچوونیش بێ.

ماوەکەی:

لای کەمی ماوەی خوێنی زەیسانی دیاری نەکراوە ، بۆیە ئافرەتی وا هەیە تەنها لە کاتی منداڵ بوونەکەدا خوێنی لێ دێت ، بەڵام لای زۆری ماوەکەی لە

چل (٤٠) ڕۆژ زیاتر تێپەڕ ناکات ، جا ئەگەر ئافرەت پێش چل ڕۆژەکە پاك بوویەوەو لە خوێن بڕا، ئەوا دەبێ خوی بشواتو دەست بکاتەوە بە نوێژ، وە ئەگەرلە چل ڕۆژ زیاتر خوێنی لێ هات ئەوە بە نەخۆشی دەژمێرێتو نابێ لە چل ڕۆژەکە زیاتر خۆی بە زەیسان بزانێ، بۆیە لە دوای ئەو چل ڕۆژە ئەگەر لە خوێنیش نەبڕێ، دەبێ خۆی بشواتو دەست بکاتەوە بە نوێژ.

**سێیەم : خوێنی نەخۆشی:**

یەکەم : پێناسەکەی:

خوێنی نەخۆشی: بریتیە لەو خوێنەی کە لە شوێنی منداڵبوونی ئافرەتەوە دەردەچێت بە بەردەوامی یان پچڕپچڕ لە غەیری کاتو حاڵەتی ئاسایی خۆی دا، بە هۆی نەخۆشیەوە.

دووەم: چۆنیەتی جیاکردنەوەی خوێنەکە:

بۆ ئەوەی ئافرەت بتوانێ ئەم خوێنە لە خوێنی بێ نوێژی جیابکاتەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات بەپێی حاڵەتەکەی خۆی:

حاڵەتی یەکەم: پێش ئەوەی توشی خوێنی نەخۆشی ببێت، ماوەی بێ نوێژی لای ئافرەتەکە زانراوبێتو بزانێت ماوەی بێ نوێژیەکەی چەندە، لەم حاڵەتەدا ئەو ماوە زانراوە بە ماوەی بێ نوێژی بۆی دادەنرێت، وە جگە لەوەیش بە نەخۆشی دەژمێرێت.

حاڵەتی دووەم: ئەوەیە کە بەردەوام خوێنی لێبێت و لە پێشیشدا ڕۆژانێکی زانراوی نەبووە بۆ دیاری کردنی ماوەی بێ نوێژیەکەی، یان هەیبووە بەڵام لە یادی نەماوە، وە یان هەر بە نەخۆشیەوە باڵغ بوبێ، وە ناتوانێ خوێنی حەیزو نەخۆشی جیابکاتەوە لە یەك ، ئەوا لەم حاڵەتەدا حەیزەکەی شەش ڕۆژ یان حەوت ڕۆژی بۆ دادەنرێت لە مانگێکەدا وەکو عادەتی زۆر بەی ئافرەتانە، وە ڕۆژانی تریشی هەمووی بە نەخۆشی بۆ دادەنرێت.

حاڵەتی سێیەم: ئەوەیە ئافرەتەکە هەر لەسەرەتاوە عادەتێکی نەبووە لەسەری بڕوات و کاری پێ کردبێ، بەڵام بتوانێ خوێنی بێ نوێژی لە خوێنی نەخۆشی جیابکاتەوە، بە پێی ڕەنگەکانیان کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ئەوا لەم حاڵەتەدا کار بەجیاکردنەوەکەی خۆی دەکات.



## چەند چرپەیەک بۆ خوشکانی بەڕێز

ئەمانە کۆمەڵێک هۆکارن کە یارمەتیت دەدەن لەسەر هۆکاری زیاد بونی ئیمان و خۆشەویستبونت لە لای خوای گەورە.

١. هەست بە چاودێری خوای گەورە بکە لە ئاشکراو نهێنیدا .

٢. پەیوەست بە شەرم و شکۆ و حەیاوە .

٣. خۆت بە دوور بگرە لە شوێنە خراپەکان و هەر هۆکارێک کە دەتگەیەنێت بە تاوان و خراپە .

٤. لە سەیرکردنی کەناڵە خراپ و بێ سودەکان خۆت بپارێزە .

٥. ئاگات لە چاوەکانت بێ و بیپارێزە لە نەزەری حەڕام .

٦. ئاگاداربە لە تێکەڵاوی و مانەوەت لەگەڵ نامەحرەمدا .

٧. گرنگی بە نوێژەکانت بدە و نوێژە سوننەتەکانیش فەرامۆش مەکە .

٨. وازبێنە لە گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقا .

٩. هاوڕێیەتی کردنی کەسانی چاک و لەخواترس ئیمانت بەرز دەبێتەوە.

١٠. کاتە بەتاڵەکانت بەشتی بەسوود پڕ بکەرەوە.

١١. بیر لەو نیعمەتانە بکەرەوە کە خوای گەورە دایناوە بۆ کەسانی لەخوا ترس و داوێن پاک لەبەهەشتدا .

١٢. بیر لەو سزاو ناڕەحەتیانەی دۆزەخ بکەرەوە کە خوای گەورە  دایناوە بۆ کەسانی خراپەکارو فاسق و فاجرەکان .

١٣. هەرگیز زیکر و یادی خوا و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و پاڕانەوە لە بیر مەکە .

١٤. زۆر دوعا بکە و بپاڕێرەوە لەخوای گەورە تا پارێزراو و دامەزراوت بکات لەسەر دین و خواپەرستی .

١٥. هەوڵی بڵاو کردنەوەی خێر و چاکە بدە لەناو هاوڕێکانتدا ، و ببە بە کەسێکی بەسود بۆ خێزان و کەسە نزیکەکانت .

لە کۆتایدا داواکارین لە خوای گەورە ئافرەتانی مسوڵمان بپارێزیت ، وە بیان کات بە کەسانێکی چاک و داوێن پاک ، و لە خواترس .



## لە فەزڵەکانی حیجاب

١. حیجاب گوێڕایەڵی کردنی خواو پێغەمبەرە ﷺ نەك عادەت و لاسایی کردنەوە.

٢. حیجاب داوێنپاکی و خاوێنیە.

٣. حیجاب ئیمانە, چونکە خودی ئیمان بریتیە لە گوفتار و کردار لە ئیسلامدا.

٤. حیجاب داپۆشەری عەیبە و عەورەتە.

٥. حیجاب بەڵگەیە لەسەر هەبوونی شەرم و حەیا.

٦. حیجاب لە سیفەتی ئافرەتانی ئیمانداری چاکەکارن.

٧. حیجاب فیترەتە و خۆدەرخستنیش ئارەزوبازیە.



## لە ئادابەکانی ئافرەتی موسڵمان

١. گوێڕایەڵی خوای پەروەردگارە و بەدڵسۆزی و نیەتپاکیەوە دەیپەرستێ.

٢. شوێنی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت و ئاگادارە لەوەی پێچەوانەی بکات.

٣. دەبێتە پێشەنگ و پێشەوایەکی چاك بۆ منداڵ و خوشکەکانی.

٤. زانست فێردەبێت و کاری پێ دەکات و جگە لەخۆیشی فێردەکات.

٥. خۆڕاگرەو ئارام دەگرێت لە رێگەی حەق و ڕاستیدا.

٦. ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك دەکات.

## دەرفەتە گرنگەکان بۆ ئافرەتی موسڵمان

خوشکی موسوڵمان :

پرسیارێکی سادەت لێ دەکەم ، پێویستە بەڕاشکاوی وەڵامی کۆتایی بدەیتەوە :

ئایا لاشەت توانا و بەرگە گرتنی ئاگری هەیە ؟

بەڕاستی حەتمەن وەڵامەکەت نەخێرە ، سوێند بەخوا تواناى نی یە !!

دەی کەواتە بۆ خۆت ناپارێزی لەو ئاگرەی گەرمیەکەی (٧٠) قات ئاگری دونیایە ؟

یانی چی خۆت دەپارێزی لەئاگری دونیا هەرچەند سوتانێکی سادەش بێت بەڵام خۆت ناپارێزی لەئاگری دۆزەخ! .

من دەبینم کاتێ کەدەست بۆ شتێک دەبەی کە لەسەر ئاگرە پارچە قوماشێک بەدەستەوە دەگری ، دەی پەند وعیبرەت وەرگرە خوشکی خۆم (کردەوەی چاکە) هاوشێوەی ئەو پارچە قوماشەیە ودەتپارێزێت لەگەرمی ڕۆژی دوایی .

پەنادەگرین بەخوا لەسزای ئاگر ، داوای چوونە بەهەشت دەکەیت لەگەڵ پیاو چاکان وساڵحاندا .

## ئەمە دە ئامۆژگارییە و با ڕێک بکەوین لەسەر ئەوەی ناوی لێ بنێین (چەند دەرفەتێکی بەنرخ )

**یەکەم :**

سووربە لەسەر ئەنجامدانی نوێژ لەکاتی خۆیدا ، و بەجوانی وڕێک وپێکی ودوور لەهەڵە وکەم وکورتی ئەنجامی بدە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : **{ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ (٤) الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ )** [الماعون:٤،٥].واتە: هەڕەشەی قورس و سەخت و ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو نوێژخوێنانەی کە لە نوێژەکانیاندا بێ ئاگان، وە گوێی پێ نادەن هەر کاتێك بیکەن کاتی ڕۆیشتبێ و بەسەرچووبێ، یان کە بیشیکەن بۆ ڕیا ئەیکەن و چاوەڕێی پاداشت نین لە خوای گەورە، وە ئەگەر نەیشیکەن لە سزای خوای گەورە ناترسێن, واتە: پەیوەست نین بە نوێژەکانیانەوە, جا هەر نەیکەن ئەوە هەڕەشەکە ئەیانگرێتەوە, وە ئەوانەیشی کە ئەیکەن بەڵام دوای ئەخەن تا کاتەکەی تەواو ئەبێ، یان کەموکوڕی ئەکەنە ڕوکنەکانییەوە یان مەرجەکانییەوە یان خشوعی تیادا نابێت یان بۆ ڕیا ئەیکەن و مەبەستیان پێی ڕیایە هەموو ئەم شتانە ئەگرێتەوەو سیفەتی مرۆڤی دووڕووە.

ئایەتەکە نەیفەرموو ئەوانەی نوێژ ناکەن ، بەڵکو دەفەرموێت نوێژ دەکەن بەڵام بەهەڵە وکەم وکورتیەوە ئەنجامی دەدەن ، وکاتێ لەسەرقاڵی وکارەکانیان

بوونەوە ئەوکات ئەنجامی دەدەن .. وە (الويل) : دۆڵێکە لەنێو ئاگری دۆزەخدا پەنا دەگرین بەخودا لێی .

تۆ پەرپرسی لەنوێژەکانت لەڕۆژی دواییدا ، گەر تەواو وڕێک بوو ئەوا هەموو کردەوەکانت ڕێک وتەواو دەبن ، وگەر ناڕێک وناتەواو بن ئەوا کردەوەکانت ناڕێک وناتەواو دەبێت ، دەی بۆ هەوڵەکانت بەفیڕۆ دەدەیت ؟

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: **(لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ : عَنْ عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ مَا عَمِلَ بِهِ ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ ؟)** صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٤١٧) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣٥٩٢)

واتە : هەردوو پێی هیچ عەبدێك نـییە لە ڕۆژی قیامەتدا هەنگاو بنێت تاوەکو پرسیاری چوار شتی لێنەکرێت :

یەکەم : سەبارەت بە تەمەنی لە چیدا بە سەری بەردووە ؟

دووەم : وە سەبارەت بە زانستەکەی ئایا کردەوەی پێ کردووە ؟

سێیەم : وە سەبارەت بە پارە و ماڵەکەی چۆن پەیدای کردووە و لە چیدا خەرجی کردووە ؟

چوارەم : وە سەبارەت بە لاشەی لە چیدا بە کاری هێناوە و دایهێناوە ؟

وەهەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

**(اِغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْل خَمْس، شَبَابك قَبْل هَرَمك، وَصِحَّتك قَبْل سَقَمك، وَغِنَاك قَبْل فَقْرك، وَفَرَاغك قَبْل شُغْلك، وَحَيَاتك قَبْل مَوْتك)**صحيح الجامع للشيخ الألباني (رحمه الله): (١٠٧٧).

واتە: سود لە پێنج شت وەربگرە پێش پێنج شت:

یەکەم : گەنجێتیت پێش پیربوونت.

دووەم : وە لەش ساغیت پێش نەخۆش بوونت.

سێیەم : وە دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت.

چوارەم : وە دەست بەتاڵیت پێش سەر قاڵیت. پێنجەم : وە ژیانت پێش مردنت.

**دووەم :**

سوور بە لەسەر ئەنجامدانی نوێژی بەیانیان، و سەعات تەوقیت بکە هەروەک چۆن بۆ کاروبارە دونیاییەکان تەوقیتی دەکەیت ، نەک تەنها خۆت بەڵکو کەسانی تریش خەبەردار بکەرەوە بەتایبەت خێزان ومنداڵ وکەس وکارت ، بەڵکو پاداشتەکەیان دەست بخەیت ، ئارام بگرە وکەم تەرخەمی مەکە ، وچاوەڕێی پاداشت بە لەخودا .

**سێیەم :**

سوور بە لەسەر ئەنجامدانی نوێژە سوننەتە ڕاتیبەکان ئەو نوێژانە کاتێکی زۆرت لێ ناگرن ، و چاوەڕێی پاداشتی خودا بە ، ودوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی ئەنجام بدە ، وچوار ڕکات پێش نیوەڕۆ ودوو ڕکات لەدوایەوە ، لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم "من صلى قبل الظهر أربعاً وبعدها أربعاً حرم الله وجهه عن النار ".[رواه أحمد والترمذي].

واتە: هەرکەسێک پێش نیوەڕۆ جوار ڕکات بکات ولەدوایشیەوە چوار ڕکات ئەوا خودا ئاگری لەسەر حەرام دەکات .

وەدوای مەغریب دوو ڕکات ، ودوای عیشا دوو ڕکات ، هەموو ئەم ڕکاتانە دەکاتە "١٢" ڕکات . لەبەر ئەم فەرموودەیەیی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم " ما من عبد مسلم يصلي لله تعالى كل اثنتي عشرة ركعة تطوعاً غير فريضة إلا بنى الله له بيتاً في الجنة " " أو بُني له بيت في الجنة ".[رواه مسلم ]

واتە: هیچ بەندەیەکی موسوڵمان نییە هەر دوازدە ڕکاتە سوننەتەکە بکات جگە لەفەرزەکان ئیلا خودا ماڵێکی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات .

وەیەکێکی تر لەسوننەتەکان کەخێری زۆر زۆرە شەو نوێژ و نوێژی ویترە ،کە یانزە ڕکاتە و دەتوانی هەر لە دوای نوێژی عیشاوە ئەنجامی بدەی، لەو نوێژەدا داوای هەموو ئەو شتانە لەخودا بکە کەدەتەوێ ، ونوێژی چێشتەنگا لەبیر مەکە.

**سوننەتە ڕاتیبەکان :**

پێش نوێژی بەیانی ------- دوو ڕکات

پێش نوێژی نیوەڕۆ ------- چوار ڕکات

دوای نوێژی نیوەڕۆ ------- دوو ڕکات

دوای نوێژی مەغریب ------- دوو ڕکات

دوای نوێژی عیشا ------- دوو ڕکات

**چوارەم:**

سووربە لەسەر ئەو زیکارانەی لەپێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتوون لەهەموو کاتەکاندا ، ودوعا بکە وبپاڕێوە هەرکات کەتوشی ناڕەحەتیەک بووی ، وپەنا مەبە بەر هیچ کەسێک ، وپەنا بەرە بەر پەروەردگار هەر ئەوە توانای وەڵامدانەوەتی هەیە ، وئەو کاتانە هەڵبژێرە کەدوعا تیایدا قەبوڵە ، لەوانە سێیەکی شەو ، لەفەرموودەیەکدا هاتووە خوای گەورە لەسێیەکی شەودا دێتە ئاسمانی دونیا ودەفەرموێت:"هل من داع فأستجب له ، هل من سائل فأعطيه "،

واتە: هیج کەسێک هەیە بپاڕێتەوە و وەڵامی بدەمەوە ، وکەسێک هەیە داوای شتێک بکات وپێی ببەخشم .

وەهەروەها ئەو کاتژمێرەی کەلەڕۆژی هەینی دا هەیە ودوعا تیایدا ڕەتناکرێتەوە تاوەکو خۆر ئاوا بوون ، ولەدوای هەموو بانگێکەوە ، ولەکاتی هەموو نوێژێکدا .

دەی باشە بۆ هەموو ئەم فرسەتانە لەدەست دەدەیت؟!

**پێنجەم :**

سووربە لەسەر ڕۆژوو گرتن بەڵکو زۆرترین پاداشت وەربگریت لەلای خودای گەورە ودەروونت پاک بکەرەوە لەتاوان .

**ڕۆژووە سوننەتەکان:**

١- ڕۆژووی دوو شەم وپێنج شەم

٢- ڕۆژووی سێ ڕۆژە سپیەکە لەهەموو مانگێکی کۆچیدا کە دەکاتە ١٣،١٤،١٥مانگ

٣- ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا کەدەکاتە ١٠مانگی موحەڕەم .

٤- ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە کەدەکاتە ٩ مانگی (ذو الحجة)بۆ کەسێک کە لەحەج نەبێت .

٥- ڕۆژووی شەش ڕۆژی مانگی شەوال .

خۆت بپارێزە لە ڕۆژوو گرتنی ئەم ڕۆژانە

١- ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنها ویاخود شەممە بەتەنها .

٢- ڕۆژووی ( یوم الشك ) ئەو ڕۆژەی کەگومان دەکرێت ڕەمەزان بێت ئەوەش کۆتایی مانگی شەعبان دەکات .

٣- ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان .

٤- ڕۆژووی (أيام التشريق) کە ١١،١٢،١٣ مانگی( ذو الحجة)یە .

**شەشەم:**

سوور بە لەسەر ئەنجامدانی واجباتەکانت بەجوانترین شێوە ، تۆ بەرپرسی لێی ، و واجباتەکانت بەرانبەر دایک وباوکت وخێزان ومنداڵ وماڵەکەت جێ بەجێ بکە.

**حەوتەم :**

سووربە لەسەر خۆ داپۆشین بەعاباکەت ـ خودا داتپۆشێت بەئیمان ـ لەکاتی دەرچوونتدا لەماڵ ، لەسەرسەرتەوە داپۆشە تاوەکو پێیەکانت ، دوور کەوەرەوە لەهەموو ئەو جلە تازانەی کەلاشەت دەردەخات ، ودەم وچاوت داپۆشە بەجلێکی ئەستوور بەشێوەیەک ببینیت وخەڵک نەتبینن ، وەهەرکەسێک تەقوای خودا بکات خوداش یارمەتی دەدات.

وەجلی کورت وتەسک وپانتۆڵ لەبەر مەکە ، ودوور کەوەرەوە لەخۆ شوبهاندن بەپیاوان وئافرەتانی بێ باوەڕ ، وپەردەی شەرم لەخۆت دامەماڵە ،

تۆی دایک  بەرپرسی لەمنداڵەکانت ونابێ ڕێگە بدەیت کچەکانت بەجلی تەسک وتەنک وکورتەوە دەرچن ئەوانەیان کەپێگەیشتوون ، ولەمنداڵیەوە منداڵەکانت لەسەر ئەو جلانە ڕامەهێنە ، چونکە هەرکەسێک لەسەر شتێک گەورە بێت لەسەری پیر دەبێت وقورس دەبێت لەسەری وازی لێ بێنێت لەکاتی گەورە بووندا .

**هەشتەم :**

دوور کەوەرەوە لەخۆ بۆن خۆش کردن لەکاتی لەماڵ دەرچووندا ، لەپێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم هاتووە فەرموویەتی :"أيما امرأة خرجت من بيتها متعطرة ومرت بالرجال لعنتها الملائكة "واتە: هەر ئافرەتێک لەماڵەکەی دەرچێت بەبۆنخۆش کراوی وبەلای پیاواندا تێپەڕ ببێت ئەوا فریشتەکان لەعنەتی لێ دەکەن .

**نۆیەم :**

دوور کەوەرەوە لە گوێگرتن لە گۆرانی ومۆسیقا ، وئەو شتانە لەمنداڵەکانتدا مەڕوێنە ، مۆسیقا وقورئان لەدڵی کەسێکدا کۆنابنەوە ، گۆرانی لەشەیتانەوەیە ، وقورئان لەلایەن خوداوەیە ، وڕیوایەت کراوە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم کاتێ شەوڕەوی پێکرا"رأى أناساً يعذبون ويصب في آذانهم الرصاص الساخن ، فسأل ما بالهم ؟ فقالوا : هؤلاء سامعي المزمار "أي أهل الغناء ".

واتە: کەسانێکی بینی سزا دەدران ومسی تواوەی گەرم دەکرا بەگوێیەکانیاندا ، پرسی ئەمانە چیان کردووە ؟ گوتیان: ئەمانە ئەوانەن کەگوێیان لەمۆسیقا دەگرد ، واتە: ئەوانەی ئەهلی مۆسیقا بوون .

هەرکەسێک شتێک لەپێناوی خوداوا واز لێ بێنێت ، خودا بەباشتر قەرەبووی بۆ دەکاتەوە .

**دەیەم :**

خوشکی خۆم بیر لەوە بکەرەوە ئێمە کەسانێکی ڕێبوارین لەم دونیایەدا ، ئەم دونیایە شوێنی تێپەڕ بوونی ئێمەیە نەک شوێنی نیشتەجێ بوون ومانەوە ، وکاتێ بیر لەوە دەکەیتەوە کەهەموومان دەمرین ودەگەڕێینەوە ، ئەوا وات لێ دەکات زیاتر تەقوای خودا بکەیت وتاعەتی بۆ بکەیت ، کوان خزم وخۆشەویست و هاوڵان ؟!

ئەوان چوون وئێمەش بەدوای ئەواندا دەچین وپێیان دەگەین ، خودا ئێمە وئەوان لەبەهەشتەکەیدا کۆ بکاتەوە .هذا والله أعلم ، ونسأل الله القبول .



## ئافرەتێک کە توشی نەزیفی و خوێن بەربون ببێت چۆن جیای بکاتەوە لەگەڵ سوڕی مانگانەکەیدا

پرسیار: ئەو ئافرەتەی کە خوێن بەربوونی تووش بووە چۆن و کەی نوێژ بکات ؟

وەڵـام: نمونەی ئەو ئافرەتەی کە خوێن بەربوونی تووش بووە، حوکمەکەی ئەوەیە کە بەئەندازەی ماوەی سوڕی مانگانەی پێشوی پێش ئەوەی ئەم ڕووداوەی بەسەردا بێت، نوێژ ناکات و ڕۆژو ناگرێت، جا ئەگەر عادەتی وا بوو کە لەسەرەتای مانگەوە بۆ ماوەی شەش ڕۆژ (بۆ نمونە) حەیزی بۆ دەهات، ئەوا لەسەرەتا هەموو مانگێکەوە بۆ ماوەی شەش ڕۆژ نوێژ ناکات و ڕۆژو ناگرێت، ئەگەر بڕایەوەو نەما ئەوا غوسڵ دەکات و نوێژ دەکات و ڕۆژو دەگرێت.

وە چۆنێتی نوێژکردنی ئەم ئافرەتە و هاوشێوەکانی ئەوەیە کە دامێنی بەتەواوەتی دەشۆرێت و شتێک بەخۆیەوە هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی خوێن بەری نەکەوێت پاشان دەستنوێژ دەگرێت لەکاتی هاتنی کاتی هەر نوێژێکی فەرزدا [واتە: بۆ هەموو نوێژێکی فەڕز دەست نوێژێکی تازە دەگرێتەوە ] پاشان نوێژ دەکات بەهەمان شێوە ئەو کارە دەکات ئەگەر ویستی جگە لەکاتی نوێژە فەرزەکان سوننەت بکات، وە دەشتوانێت نوێژە سوننەتەکان دوای فەڕزەکە بەهەمان دەست نوێژ بکات والله أعلم.

## توشبوون بە لەشگرانی لەکاتی سوڕی مانگانەدا

پرسیار

ئەگەر ئافرەتێک لەکاتی سوڕی مانگانەدا توشی لەشگرانی ببێت جا بەهۆی بینینی خەووەوە بێت یان دەستبازی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بێت ، ئایا پێویستە لەسەری خۆی بشوات ؟ وە دەتوانێت خۆشۆردنەکەی دوابخات تاکوو پاک دەبێتەوە ، یەکجار خۆی بشوات ؟

وە دروستە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەستبازی بکات لەکاتی سوڕی مانگانە ؟

وەڵـام

سەرەتا ئافرەت دروستە دەست بازی و یاری بکات لەگەڵ پیاوەکەیدا یاخود لەگەڵ پیاوەکەی هەر شتێک بکات کە حەڵاڵە لەنێوانیاندا بەڵام دروست نیە پیاو لە عەورەتەوە بچێتە لای خێزانی یا لە کۆمەوە پەنابەخوا ، بەڵام بۆیان هەیە کە هەر شتێکی تر بکەن کە لەسنوری شەرعدا ڕێگەی پێدراوە هەروەکو لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە ڕەزای خوای لێبێت هاتوە کە فەرمویەتی پێغەمبەری -خوا صلى الله عليه وسلم - هەموو کارێکی لەگەڵدا دەکردم کە لەسوڕی مانگانەدابوم جگە لە جیماع و جووت بوون نەبێت، وە ئەگەر ئافرەت لەکاتی دەسبازی لەگەڵ پیاوەکەیدا مەنی هات یاخود کەوتە حاڵەتی ڕەحەت بونەوە بەجۆرێک ئاوی هات ئەوا دەتوانێت خۆشۆردنی دوا بخات مادام لەسوڕی مانگانەدایە هەرکاتێک لەسوری مانگانەدا پاک بۆوە یەک جار خۆی

دەشوات ، بەڵام باشتر وایە خۆی بشوات تا بتوانێت بێ بەش نەبێت لە خوێندنەوەی قورئان ، ئیمامی شافعی دەفەرموێت: ئافرەت ئەگەر توشی لەشگرانی بوو دواتر توشی سوڕی مانگانە بوو ، پێش ئەوەی خۆی بشوات، ئەوا واجب نیە لەسەری خۆی بشوات مادام توشی سوڕی مانگانە بووە .

کتاب الأم ٦١/١

وە ئیمامی ابن القدامة فەرمویەتی : ئەگەر ئافرەت لەسوڕی مانگانەدا توشی لەشگرانی بوو ئەوە واجب نیە لەسەری کە خۆی بشوات تا ئەو کاتەی لەسوڕی مانگانەکەی پاک دەبێتەوە ، ئەمەش فەتوای ئیمامی أحمد و ئیسحاقە ڕەحمەتی خوایان لێبێت .



**پرسیار: حوکمی دانانی تەلی ددان بۆ ڕێک کردنەوەی ددانەکان چیە ؟**

وەڵـام: گەر کەسێک ددانەکانی لارو لێچ بێت، ئەمەش عەیب و کەم و کورتیە دروستە کە ڕاستیان بکاتەوە تا هەموی دەکەوێتە ئاستی یەکترو ڕێک دەبنەوە .

لەلایەن زانای شەرع زان ابن عثیمین وەڵام دراوەتەوە خودا لێی خوش بێت

## نیشانەی پاکبوونەوەی ئافرەت لە سوڕی مانگانە

پرسیار

وەکو زانراوە کە نیشانەی پاکبوونەوەی ئافرەت (القصه البیضاء) - ئاوە سپیەکەیە پرسیارکەر دەڵێت: من ئەم نیشانەیە نازانم وە دوای خۆشۆردن ئاوێکی ڕەنگ قاوەیی کاڵ دەبینم ئایا ئەم ڕەنگە بەواتای پاکبوونەوە دێت ؟

وەڵـام

پاکبوونەوە واتە نەمانی ئاسەواری خوێن، جا ئەگەر بە لۆکە یان هەر شتێکی تر پشکنینت بۆ خۆت کرد و شوێنەواری خوێنت نەبینی دەتوانیت خۆت بشۆیت، ئەگەرچی ئاوە سپیەکەشت نەبینی، (القصه البیضاء) ئەو ئاوە سپیەیە کە هەندێک ئافرەت لەکۆتایی سوڕی مانگانەیان دەیبینن و نیشانەیە بۆ پاکبوونەوە و نەمانی سوڕی مانگانەیان .

وە هەندێک لە ئافرەتان ئەمە نابینن بۆیە لەم حاڵەتەدا تەنها لۆکە یان پارچە پەڕۆیەکی پاک یان هەر شتێکی تر بەکاردەهێنن بۆ خۆیان ئەگەر پاکبوونەوەیان بینی و ئاسەواری خوێنیان نەبوو ئەوا دەتوانن خۆیان بشۆن ئەگەرچی ئاوە سپەیەکە (القصه البیضاء)ـش نەبینن .

وەڵامی شێخ ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێ

## زۆرترین ماوە و کەمترین ماوەی سوڕی مانگانە

پرسیار: ئایا ڕۆژەکانی سوڕی مانگانە دیاری کراوە، وە زانراوە بەژمارە چەند ڕۆژە ؟

وەڵـام ژمارەی رۆژەکانی سوڕی مانگانە لەڕووی زۆری و کەمیەوە دیاری نی یە لەسەر وتەی صەحیح، لەبەر ئایەتی: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذىً فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ ) (البقرة)

واتە: پرسیارت لێدەکەن ـ ئەی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم ـ لەبارەی خوێنی حەیز و سوڕی مانگانەی ئافرەتانەوە ـ کە بریتیە لەو خوێنەی لەڕەحمی ئافرتانەوە دێتە دەرەوە بە فیترەت لە چەند کاتێکی دیاریکراودا ـ ؟ تۆش لەوەڵامدا پێیان بڵێ : ئەو خوێنە پیسیەکی قیزەونە، و زیان دەگەیەنێت بەوەی کە نزیکی بکەوێتەوە، بۆیە خۆتان بە دووربگرن لە جووتبون لەگەڵ ئافرەتان لەماوەی سوڕی مانگانەدا هەتا خوێنەکە دەبڕێتەوە وپاک دەبنەوە.

بۆیە خوای گەورە رۆژەکانی سوڕی مانگانەی دیاری نەکرد بەڵکو بەوە دیاری کرد هەتا پاک دەبنەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوڕی مانگانە وەستاوە لەسەر هەبونی خوێن بەمەرجێک خوێنی نەخۆشی ژنانە نەبێت ، جا هەرکاتێک خوێن هەبوو ئەوا حوکمەکەشی سابت دەبێت و هەرکاتێکیش پاك بوویەوە لێی ئەوا حوکمەکانی نامێنن ولادەچن .

بەڵـام ئەگەر خوێنەکە بەردەوام بێت لەگەڵ ئافرەتەکەدا و هەرگیز نەبڕێتەوە، یان زیاتر بڕوات لە پانزە ڕۆژ یاخود خوێن ببینێت لەدوای پاکبونەوە یان ئەو خوێنە بەهۆی نەخۆشی ژنانەوە بێت یاخود خوێنە لەخوێنی سوڕی مانگانە نەچێت و هیچ نیشانەیەکی سوڕی مانانەی پێوە دیار نەبێت ئەوا بەسوڕی مانگانە دانانرێت نوێژو ڕۆژی خۆی دەکات زۆر جار ئەم خوێنە خوێنی (استحاضة)یە .

تێبینی: زانایان دەفەرموون زۆرترین ماوەی سوڕی مانگانە پازدە ڕۆژە لەم ڕێژەیە زیاتر نەخۆشی استحاضەیە واتە خوێن بەربون و نەزیفی ئافرەتە وەهەر خوێنێکی تر لەدوای ماوەی خوێنی سوڕی مانگانەی ئافرەت بێت دەبێت ئافرەت بەنیشانەکان بیناسێتەوە یان ئەگەر لەدوای بینینی ئاوە سپیەکە ئەو خوێنەی بینی ئەوکات بەسوڕی مانگانە دانانرێت بەڵکو خوێنی نەخۆشیە .



## حوکمی خۆگۆڕینی ئافرەتان لەدوکانی پۆشاک و جلوبەرگ

پرسیار

حوکمی خۆگۆڕینی ئافرەتان لەدوکانی پۆشاک و جل و بەرگدا چی یە بەمەبەستی تاقی کردنەوەی ئەو پۆشاکەی کەوا دەی کڕێت، ئایا دەکەوێتە ژێر ئەو هەڕەشەی کەوا پێغەمبەری خوا کردویەتی لەو جۆرە ئافرەتانە ؟

وەڵـام

بێگومان ئافرەت عەوڕەتە هەروەکو پێغمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم_ دەفەرموێت : [ المرأة عورة ] ...

وە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی هەر ئافرەتێک جگە لەماڵەکەی خۆی یا جگە بۆ پیاوەکەی خۆی پۆشاک دابکەنێت ئەوا ئەو پەردەیەی لەنێوان ئەو کەسەو خوادایە لای داوە ، هەر بۆیە دروست نی یە ، پاشان ئەم جۆرە دوکانانە زۆر جار دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم ئافرەتە پارێزراو نەبێت، چونکە بیندراوە و بیستراوە کە وێنەی ئافرەتان لەم شوێنەدا گیراوە بە کامێرای شاراوە یاخود بونی ئامێری چاودێری ، جا پێویستە ئافرەتان وریا بن ئەمە جگە لەوەی حەڕامە لەسەر ئافرەت جگە لەماڵەکەی خۆی یا لای جگە لە پیاوی خۆی لاشەی خۆی دەربکات ئیلا لە حاڵەتی پێویستی نەبێت بۆ نمونە لەسەفەرێکدایە و لەسوڕی مانگانەدا پاک دەبێتەوە لەم حاڵەتەدا لەشوێنێکی ئەمیندا خۆی دەشوات دور

لەچاوی نامەحرەم داکەندنی پۆشاک جگە لەماڵ یا زۆر بۆ زەروری نەبێت دروست نی یە و حەڕامە ...

تێبینی زۆرێک لە ئافرەتان لەلای ئافرەتانی تر جا چ خوشکی بێت یا هاوڕێی بێت یا هەر کەسێکی تر بێت با ئەم کەسەش ئافرەت بێت دروست نی یە ، عەورەتی یەکتر بینین یا پەردەی شەرم و شکۆ نەمێنێت لەنێوان یەکتردا بەداخەوە ....

بۆیە خۆ گۆڕینی ئافرەتان لە ژوری خۆگۆڕینی ئافرەتان دروست نی یە ، وەهەر کاتێک کەوا پۆشاکێکت کڕی ئەگەر ویستت تاقی بکەیتەوە بچۆ لەماڵەوە تاقی بکەوە گەر پارەی زیاتریش بدەیت ، بۆ پاراستنی شکۆمەندیت وە جێبەجێ کردنی فەرمانی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم-



## پرسیار: حوکمی تاتۆ کردن و ددان شاش کردن یان گۆڕینی ڕەنگی پێست بە تەجمیل چیە ؟

وەڵـام: پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم - فەرمویەتی: [ لعن الله الواشمة والمستوشمة والواشرة والمستوشرة ] .

واتە: لەعنەتی خوا لەو کەسە بێت کە خاڵ دەکوتێت وە ئەوەش کە بۆی دەکوتێت، وە لەعنەتی خوا لەو کەسە بێت کە ددانەکانی شاش دەکات وە ئەوەش کە بۆی دەکات .

کەواتە: [ الوشم ] بریتییە لە کوتانی خاڵ و ڕەنگکردنی لەسەر جەستە، وە [ الوشر ]، بریتییە لە کەلێن خستنە نێوان ددانەکان و شاش کردنیان، ئەم دوو جۆرە حەڕامە چونکە مەبەست لێی بۆ جوانکاریە .

بۆیە ئەوانەی کە ئەسمەرن یاخود ڕەنگی پێستیان بەلای ڕەشدایە گۆڕینی ئەم ڕەنگە بۆ سپی حەڕامە و ڕێگە پێ نەدراوە، چونکە دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی گۆڕینی کارەکانی خوا کە مەبەست تەنها جوانکاری بێت .

گەر کەسێک بپرسێت و بڵێت: ئەی چی دەڵێن دەربارەی کەسێک کە چاوی خێلە، ئایا ئەمە جوانکاریە یاخود لابردنی کەم و کورتیە ؟؟

وەڵـام: ئەم شتە دەکەوێتە ژێر لابردنی کەم و کورتی و عەیبێک بۆیە دروستە .



## کە هاوسەرگیریت کرد تۆش وابکە بەختەوەر دەبیت

## ئافرەتێک کە تەنها لە کتێبەکان دەست دەکەوێت

دەگێڕنەوە ڕۆژێک "قاضي شريح" چاوی بە "ئیمامی شعبي" کەوت و دەربارەی بارودۆخی نێو ماڵی پرسیاری لێ کرد واتە خێزانەکەی .. گوتم؛ بیست ساڵە شتێکم لێ نەبینیوە توڕەم بکات ئەویش پرسی؛ چۆن ئاوایە؟ گوتم؛ یەکەم شەو کە چوومە لای خێزانم ئەوەندە جوان و لەبەر دڵان بوو، بە خۆمم گوت هەستە دەستنوێژێک بشۆ و دوو ڕکاعەت نوێژ بکە وەکو شوکرانەی خوا، کە سەلامم دایەوە دەبینم خێزانم لە دوامەوە نوێژ دەکات کاتێک خزم و کەس ماڵەکەیان جێهێشت و ڕۆشتن ڕۆشتمە لای و دەستم بۆ درێژ کرد

گوتی؛ لەسەرخۆ ئەی أبا أمية سوپاس بۆ خوای گەورە و سەڵاواتێکی لەسەر پێغەمبەردا ﷺ و گوتی؛ من ئافرەتێکی بێگانەم شارەزای ئەخلاقت نیم بۆیە پێم بڵێ چیت پێ خۆشە وە ڕقت لە چیە تا وازی لێبێنم بۆت دواتر گوتی؛ بێگومان لە عەشیرەتی ئێوە کچ هەبووە ویستویەتی هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات وە لە عەشیرەتی منیش پیاو هەبووە ویستویەتی هاوسەرگیری لەگەڵ من بکات بەڵام هەموو کارێک تەنها بەو جۆرە دەبێت کە خوا دەیەوێ و من و تۆ بۆ یەکتری بووین بۆیە داوات لێدەکەم گوێڕایەڵی خوای گەورە بکە وەک

دەفەرمووێت؛ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ .. من تەنها ئەوەندەم هەیە بۆ گوتن .

شریحی قاضی گوتی؛ ئەی شعبي والله وات لێکردم ئەو بابەتە بکەمە وتار

شعبي چیرۆکەکە بەردەوام دەکات؛ بە خێزانم گوت تۆ کۆمەڵە قسانێکت کرد ئەگەر بەجێیان بگەیێنین ئەوە خۆشبەخت دەبی وە ئەگەر نا دەبێتە بەهانە لەسەرم من ئەوە و ئەوەم لا خۆشە وە ئەوە و ئەوەشم ڕق لێیە

هەرکاتێک شتێکی چاکت بینی بڵاوی بکەرەوە، هەرکاتێکیش خراپەیەکت بینی دایبپۆشە

گوتی؛ ڕات چیە لەسەر سەردانی کردنی خزمانم ؟

گوتم؛ نامەوێ هاوەڵزاواکانم بێزارم بکەن

گوتی؛ دەتەوێ ئەو دراوسێیانەی کە خۆشت دەوێن ئیزنیان بدەم بێنە نێو ماڵەکەت ئەوانەشی ڕقت لێیانە ڕێگر بم لە هاتنیان ؟

گوتم؛ فڵان چاکەکارە، فڵانیش خراپەکار،

شریح دەڵێ؛ شەوێکی پڕ ڕازم لەگەڵ بەسەر برد وە ساڵانێک کە تەنها ئەو شت و کارانەی دەکرد کە من پێم خۆش بوون

کاتێک گەشتینە سەری ساڵ لە کۆبونەوەیەک بووم گوتیان فڵانە ئافرەت لێرەیە گوتم؛ کێیە؟ گوتیان: خەسوتە .. دایکی هاوسەرەکەت

بەلامدا سوڕاو پرسیاری کرد؛ هاوسەرەکەت چۆنە؟ مەبەستی کچکەی خۆی بوو

گوتم؛ چاکترین هاوسەرە

گوتی؛ ئەی أبا أمية ئافرەت لە دوو حاڵەتدا خراپ دەبێت

کاتێک کوڕی دەبێت، وە کاتێک زۆر ڕێگەپێدراو دەبێت لەلایەن هاوسەری

سوێند بەخوا پیاوان لەو ئافرەتە خراپتر نادۆزنەوە کە زۆر نازی هەڵدەکێشن و بۆ هەموو شتێک ئیزنی دەدەن

ئەگەر پێویستی بەوە بوو پەروەردە بکرێت، بیکە وە ئەگەر پێویستی بەوە بوو ڕێنوێنی بکرێت، بیکە

بیست ساڵ خێزانم بوو لە یەک شت سزام نەدا تەنها جارێک ئەویش دواتر دەرکەوت من تاوانبار بووم لە ڕووداوەکە .

أحكام النساء لابن الجوزي ص ١٣٤



## حوکمی ئەو ئافرەتانەی کە شیری خۆیان نادەن بە منداڵەکانیان

پرسیار : حوکی ئەو ئافرەتە چیە کە شیری خۆی بە منداڵەکەی نادات بەبێ هیچ عوزرێکی شەرعی ؟

وەڵـام : بەداخەوە زۆرێک لەئافرەتان لەم بابەتەدا کەمتەرخەمن لەکاتێکدا هیچ عوزرێکی شەرعیان نیە بەبیانوی جیاواز جیاواز منالەکانیان بێ بەش دەکەن لە شیرپێدانیان، زۆریان دەڵێن ناتوانین یان تاقەتمان نیە یان سنگمان تێک دەچێت، ئەم بابەتە بابەتێکی ترسناکە پێویستە بەوریاییەوە ماماڵەی لەگەڵدا بکرێت، جگە لەوەی شیری قوتو بۆمنداڵ زیانی هەیە وەک شیری دایک نابێت هەرگیز، پاشان هەموو دکتۆرێک ڕێنمایی ئافرەتان دەکەن کە شیری خۆیان بدەن بە منداڵەکانیان نەک شیری تر، وە جگە لەوەی شیری دایک وادەکات ئەم منداڵ و دایکە زیاتر هۆگری یەکتر ببن

(پێغمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- هەڕەشەی کردووە لەو ئافرەتانەی کە شیری خۆیان نادەنە منداڵەکانیان، خەونێکی بینی لەخەویدا ئافرەتانێکی بینی کە لەناو گۆڕەکانیاندا مارێک سنگیان دەگەزێت بەسەری مەمکیانەوە دەدات، دەفەرموێت: منیش وتم ئەمانە بۆ وا سزادەدرێن ؟؟ پێیان وتم ئەمانە ئەو ئافرەتانەن کە منداڵەکانیان دەگرنەوە لەشیری خۆیان شیری خۆیان نادەن بە منداڵەکانیان) . بۆیە دروست نیە ئافرەت منداڵەکەی بێ بەش بکات لەشیری خۆی بەیانوی جۆراو جۆر .

**ئایا ئەو ئافرەتانەی کە هەست بە شێداری یان التهابات دەکەن لە دامێنیاندا لەسەریان پێویستە کە بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژ بشۆن ؟**

پرسیار کرا لە شێخ عبدالعزیز بن باز

ئێمە کۆمەڵە ئافرەتانێکین بەدەست شێداری و التهاباتی دامێنەوە دەناڵێنین کە لە دامێنمان دەردەچێت ئایا پێویستە لەسەرمان بۆ هەموو نوێژێک دەسنوێژ بشۆین ؟ کە ئەمەش زۆر قورسە بۆ بەشێکمان !

لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر ئەو شێداریەی بە شێوەیەکی بەردەوام هەبوو یاخود زۆر جار وابوو ئەوا پێویستە لەسەر هەر یەکێکتان کە بۆ هەر نوێژێک دەسنوێژ بشوات چونکە ئەوە وەکو حوکمی خوێن بەربووبن [الاستحاضە] وایە یاخود وەکو ئەوانەی میزیان ناوەستێت میزەچرکەیان هەیە لەوانە هەژمار دەکرێن .

بەڵام ئەگەر ئەو شێداریەی تەنها لە هەندێک کات هەبوو ئەوا حوکمی وەکو حوکمی میز وایە هەر کاتێک هەستی کرد خاوێنیەکەی نامێنێت ئەوا دەست نوێژی دەشکێت ئەگەر لە ناو نوێژیش بێت .

مجموع الفتاوی ومقالات الشیخ ابن باز (١٠/١٢٩)



## حوکمی سۆنەر کردن لەلای دکتۆری پیاو

پرسیار

حوکمی سۆنەر کردنی ئافرەتان چیە لەلای دکتۆری پیاو ؟

وەڵـام

سۆنەر کردن لەلای پیاو تاوەکو دکتۆرەی ئافرەت هەبێت بەهیچ شێوەیەک دروست نیە بەڵام کە نەبوو وە بۆ پێویستی بوو دروستە واتە تەنها لە حاڵەتێکدا دروستە دکتۆری پیاو سەیری لاشەی ئافرەت بکات کە ضەرووریەت و پێویستی بێت بۆ نموونە دکتۆری ئافرەتیان بەدەست نەکەوێت یان لەشارێکی دیکە بێت و ئەوانیش توانای چوونیان بۆی نەبێت یاخود لێی نەزانێت و بەتەواوی ئافرەتەکە پێویستی بەوە بوو کە پشکنینی بۆ بکرێت ئینجا دروستە لەلای دکتۆری پیاو ئەنجام بدرێت بەڵام دەبێت لەم کاتەشدا پیاوەکەی خۆی لابێت و بەتەنها نەچێتە ژوورەوە بۆ لای دکتۆرە پیاوەکە کەمتەرخەمیش لەم بابەتەدا کارێکی پێچەوانەی شەرعە و خراپە نابێت پشتگوێ بخرێت .



## حوکمی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کەسی نوێژنەکەر

پرسیار

ئایا دروستە کچێک شوو بکات بەکوڕێک کە نوێژ ناکات یا کوڕێک کچێک بهێنێت کە نوێژنەکەرە ؟

وەڵـام

بەهیچ جۆرێک دروست نیە کچ شوبکات بە کوڕێکی نوێژ نەکەر وە بەپێچەوانەشەوە ، تاوانی نوێژنەکردن لەتاوانی ڕیباخواردن و پیاو کوشتن و زیناکردن گەورەترە هەروەکو ابن القیم فەرمویەتی ، هەر بۆیە زانایان خیلافیان لە نێواندایە ئایا نوێژ نەکەر کافرە یاخود موسڵمان ، بۆیە مامۆستایانی ئاینی کاتێک کەسێک لەکەسێک مارە دەکەن یەکەم پرسیار لێیان ئەوەیە نوێژ دەکەن یاخود نا چونکە زۆرێک لە زانایان دەفەرمون مارەیی نایەت ئەو کەسەی کەوا نوێژ نەکەرە کەواتە بابەتەکە زۆر ترسناکە پێویستە وریابین لێی .

شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە ڕەحمەتی خودای لێبێت دەڵێت: ئەگەر هەموو خەڵکی ڕێگری لەوە بکەن کە پیاو نابێت ئافرەتێک بکاتە هاوسەری خۆی کە دزو زیناکارو مەشرووب خۆرەو جگە لەمانەش، دەبێت ڕێگری لەوەش بکەن کە ئافرەتی نوێژنەکەر نابێت لەگەڵی هاوسەرگیری بکرێ، کە ئەمەش یەکێکە لەگەورەترین تاوانەکان بەڕای هەموو زانایان!

[جامع المسائل( ٤/١٤٢)]

هەروەها پرسیار کرا لە شێخ ابن باز ڕەحمەتی خوای لێبێت دەربارەی کەسی نوێژ نەکەر ئایا ژنی پێ دەدرێت یاخود نا ؟

لەوەڵامدا فەرمووی: ئەو پیاوەی کەوا نوێژ ناکات دروست نیە ژنی پێ بدرێت، وە ئامۆژگاری هەموو سەر پەرشتیاران و وەلی ئەمری ئافرەتان دەکەین کەوا لەخوا بترسن لەبەشودانی کچەکانیان ، وەنەیان دەن بەکەسانێک کە نوێژ نەکەرن .

النور على الدرب ( ٢٠ / ١٥٤ ) .



## حوکمی هاتنی خوێن یان نەزیفی بەهۆی دانانی لەولەب

پرسیار

ئەگەر ئافرەت لەولەبی دانا دوای ئەوە خوێنی بینی ئایا لە خوێنی (الإستحاضة) خوێنی نەخۆشی هەژمار دەکرێت یاخود بە سوڕی مانگانە ؟ وە ئایا ڕۆژوو دەگرێت و نوێژ دەکات ؟

وەڵـام : ڕەچاوی بەرواری سوڕی مانگانەی دەکات، ئەگەر خۆی گەیشتبووە کاتی بێ نوێژیەکەی ئەوا واز لە نوێژ دەهێنێت واتا کاتی سوڕی مانگانە ، بەڵام ئەگەر کاتی سوڕی مانگانەی نەبوو ئەوا بە خوێنی بەربوو خوێنی نەخۆشی (الإستحاضة ) هەژمار دەکرێت بەردەوام دەبێت لە نوێژەکانی بەڵام بۆ هەر نوێژێک دەسنوێژ نوێ دەکاتەوە.

ئەی ئەگەر کاتی بێ نوێژیەکانی دیاریکراو نەبوو ؟

بەهەمان شێوە، ڕەچاوی سوڕی مانگانەکەی دەکات .

**بەپوختی**

ئەگەر خوێن بەربون یان بینینی خوێن گەر لەکاتی سوڕی مانگانەدا نەبوو ئەم خوێنەی کە ئافرەت دەیبینێت بەهۆی دانانی لەولەبەوە بێت یان نەزیفی و نەخۆشیەوە ئەم خوێنە خوێنی سوڕی مانگانە نیە بەڵکو خوێنی ئاساییە نوێژ دەکات و ڕۆژوو دەگرێت وە گەر پیاوی هەبێت دروستە سەرجێیی لەگەڵ پیاوەکەشی بکات بەڵام بۆ هەموو نوێژێک دەست نوێژ تازە دەکاتەوە .

## هەندێک لەزیانە هەرە دیار ومەترسیدارەکانی پێڵاوی پاژنە بەرز

ئەگەر بزانیت زیانەکانی لەپێ کردنی پێڵاوی پاژنە بەرز چەندە و چی لەجەستەت دەکات هەرگیز لەپێی ناکەیت جگە لەوەشی کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردووە

هەندێک لە ئافرەتان بەرگەی ئازاری پێڵاوی پاژنە بەرز دەگرن لە گوێڕایەڵی شەیتان، وە سەبر و ئارام ناگرن لەپۆشینی عەبا لە گوێڕایەڵی خوای میهرەبان

لەزیانەکانی پێڵاوی پاژنە بەرز ئەوەیە:

١. دەبێتە هۆی گۆڕان و تێکدانی ئێسک و کارایی بڕبڕەی پشت بەهۆی دابەشبوونی نادروستی کێشی جەستە و مەیلبوون و خواربوونەوەی نائاسایی .

٢. خواربونەوەی بڕبڕەی پشت زیاد دەکات، بەو پێیەی جەستەی ئافرەتان بەشێوەیەکی سروشتی کەوانەییە و هەندێک خوارە و لەکاتی لەپێکردنی پێڵاوی پاژنە بەرزدا خواربونەوەکە زیاد دەکات وە دەبێتە هۆی ئازاری پشت .

٣. مەترسی تووشبوون بە ئینزلاق و زیان گەیاندن بە بڕبڕەی پشت زیاد دەکات .

٤. ئەگەری خوران و کەم بونەوەی مۆخی ئیسکەکانی ئەژنۆ زیاد دەکات بەهۆی کێشی زۆر لەسەری و دابەشبوونی ناهاوسەنگی کێشی جەستە .

٥. دەبێتە هۆی کورتبوونەوە و زیان گەیاندن بە شانەکان، وەکو پەتی قاچەکان و ماسولکەکان و شانەکان و بەشی دواوەی ئەژنۆ و پێشەوەی ڕانیش کورت دەبنەوە .

٦. دەرکەوتنی شێواوی جۆراوجۆر لەئێسکی پەنجەی پێ .

٧. زیان گەیاندن بە منداڵدان بەهۆی تەسکبوونەوەی گۆشەی نێوان ڕان و حەوز و زیادبوونی مەترسی خوێنبەربوون لەکاتی سوڕی مانگانە و زیادبوونی نیشانەکانی پێش سوڕی مانگانە .

٨. دەبێتە هۆی توشبوون بە برین و هەوکردنی پەنجەکانی پێ کە زیانێکی زۆر باوە .

٩. هەستکردن بە سووتانی پەنجەکانی پێ کە ئەمەش دیاردەیەکی دەمارگیرییە بەهۆی فشاری بەردەوام لەسەریان .

١٠. زیادبوونی مەترسی شکان و پچرانی شانەکان کە لە ئەنجامی (کەوتنە)وە ڕوودەدات .

**ئایا ئەگەر ئافرەت لە سوڕی مانگانە بوو دەتوانێت سوجدەی تیلاوە و سوجدەی شوکر ببات ؟**

وەڵـام

هیچ کێشەی تێدا نیە، چونکە لە کاتی بردنی سوجدەی تیلاوە یان سوجدەی شوکر پاکیەتی بە مەرج دانانرێ بۆیە گەر ئافرەت لە سوڕی مانگانەش دابوو ئەوا دەتوانێ ئەو دوو سوجدەیە ببات لەکاتی خوێندنەوەی قورئان و گەشتن بە شوێنی سوجدە .

ماڵپەری ڕەسمی شێخ ابـن بـاز

هەمان پرسیاریش لە شێخ عبدالرحمن بن ناصر البراک کراوە دەربارەی هەردوو سوجدەکە و داپۆشینی سەریش فەرموویەتی:

بۆی هەیە سوجدە ببات چونکە بردنی سوجدەی تیلاوە یان شوکر نوێژ نیە وەک پێشتر باسکرا ئەو مەرجانەی تیانیە کە لەنوێژدا هەیە بۆ سوجدە بردن نە پێویست بە پاکیەتی دەکات نە داپۆشین .



## حوکمی خوێندنەوەی قورئان بۆ ئافرەتان بەبێ سەرپۆش

پرسیار

ئایا ئافرەت بۆی هەیە لەکاتی خوێندنەوەی قورئان لە کاتی خەوتن یان هەر کاتێکی تر سەرپۆش نەپۆشێت ؟

وەڵام

بەڵێ دروستە، ئافرەت دەتوانێت قورئان بخوێنێت بەبێ سەرپۆش چ کاتی خەوتن بێت یاخود هەر کاتێکی تر بەر لە خەوتنەکەی، سەرپۆش لەسەرکردن نەکراوە بە مەرج بۆ ئافرەتان لە کاتی قورئان خوێندنەوە .

تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە پیاوێکی لێبێت، لەو کاتەدا دەبێت قژی و ڕووخساریشی داپۆشێت .

پەڕەی فەرمی شێخ ابن عثیمین

تێبینی/ قورئان خوێندن بەپاڵ کەوتن (ڕاکشان)ـەوە دروستە .



وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ ...

## نامەیەکی کورت وتایبەت بەئافرەتان لەماوەی سووڕی مانگانەدا

لەدونیادا بەهەشتێک هەیە ئەویش نزیک بوونە لەخودا وئارام بوونە بەنزیکی لێی ، و نزیکترین کات کەبەندە لەپەروەردگاریەوە زۆر نزیکە کاتی سوژدە بردنیەتی ، دەی کەواتە ئافرەت چ بکات لەکاتێکدا عوزرێکی خودایی بووەتە ڕێگر لەسوژدە بردنی ؟

ئەم بابەتە زۆر توشی دڵەڕاوکێی کردم ، لەکتێب وئینتەرنێت بۆی گەڕام، بەدوای شتێکدا گەڕام کەلێنی نوێژ لەماوەی سووڕی مانگانەدا بۆ ئافرەتان پڕ بکاتەوە ،بەڵام ئەو بابەتانەی دەستم کەوت کورت بوون وتەنها باسی ئەحکامەکانی حەیز بوون .

ئامانجی من ئەوەیە ئایا چۆن ئافرەتێک کەلەسووڕی مانگانەدایە دەتوانێت پارێزگاری بکات لە نزیک بوونی لەخودا ولێی دوور نەکەوێتەوە لەو ماوەیەدا کەنزیکەی سێ بەشی تەمەنیەتی.

وەلێرەوە پێم باش بوو نامەیەکی کورت لەم بارەیەوە ئاڕاستە بکەم ، بەئومێدی ئەوەی سوود بەخش بێت وببێتە خێرێکی نەبڕاوە بۆم ، وزیاتر لەخودام نزیکم بکاتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: **(یا أیّها الذین آمنوا استعینوا بالصّبر والصّلاة إنّ اللهَ معَ الصّابرین)** البقرة ١٥٣.

واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە پشت بە ئارام گرتن و نوێژ ببەستن بەرامبەر ئەو بەڵاو ناخۆشیانەی کە رووبەڕووتان ئەبێتەوە ،بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ ئارامگرانەیاندایە بەوەی سەریان ئەخات و پشتیوانیان ئەبێ و یارمەتیان ئەدات.

ئەم ئایەتە سەرەنجی ڕاکێشام لەو ڕۆژانەدا کەتوشی حەیز دەبووم ودوور دەکەوتمەوە لەنوێژ وڕۆژوو ، وئەم ئایەتە مانایەکی تازەی پێ بەخشیم ، خوای گەورە لەم ئایەتەدا لەگەڵ بوونی خۆی بەیان کردووە بۆ کەسانی ئارام گر ونەیفەرمووە تایبەتە بەنوێژ خوێنان ، ئەمە وەک ئەوە وایە پێت بڵێت ئەوە نوێژ نییە بەتەنها مرۆڤ لەخودات نزیک دەکاتەوە بەڵکو ئارامگرتنیشە ، و لەئایەتی تردا فەرموویەتی: (والله یحبُّ الصّابرین) آل عمران ١٤٦

واتە: وە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە ئارامگرن.

دوور نی یە بەئارام گرتن ئەی ئافرەت بگەیت بەپلەیەک کەبەنوێژ وعیبادەت بەدەستی نەهێنیت ، وڕەنگە دوای ئارام گرتنت بگەڕێیتەوە بۆ نوێژ بەخۆشەویستیەوە کەزیاتر دەرگای نزیک بوونەوەت لێ بکرێتەوە .

## دڵتەنگ مەبە ..

گەر سووڕی مانگانە بووە ڕێگر لەنێوان تۆ و ڕاوەستانت لەبەردەم پەروەردگارتدا ، و ئەو ڕۆژەی کەخاتو عائیشە توشی حەیز بوو لەحەجدا وەدەگێڕێتەوە ودەڵێت: (دخل عليَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم بِسَرِفَ وأنا أبكي، فقال: (ما لك أنَفِسْتِ). قلت: نعم، قال: (هذا أمر كتبه الله على بنات آدم) رواه البخاري وغيره.

واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەسەریف هات بۆ لام من دەگریام فەرمووی: (چیتە؟ کەوتیتە سوڕی مانگانەوە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (ئەوە کاری خوایە لەسەر کچانی ئادەمی بڕیارداوە .

ئەمە بڕیارێکی گشتگیرە وهەموو ئافرەتان یەکسانن تیایدا وکاری خودای کارزان وکاربەجێیە ، لەفەرموودەیەکدا هاتووە عائیشە گێڕاویەتیەوە لەسوننەنی نەسائی دا هاتووە " **ما منِ امرئٍ تكونُ لَهُ صلاةٌ بليلٍ يغلبُهُ عليْها نومٌ إلاَّ كتبَ لَهُ أجرُ صلاتِهِ وَكانَ نومُهُ عليْهِ صدقةً** "

واتە : هیچ کەسێک نیە ڕاهاتبێت لەسەر شەو نوێژ و لەنیەتی دابوبێت بیکات بەڵام خەو بەسەریدا زاڵ بوبێت ئەوا خوای گەورە پاداشتی نوێژەکەی بۆ دەنوسێ و خەوەکەشی بۆ دەگێڕێ بە خێرو چاکە.

وەلەسەحیحی بوخاری دا هاتووە ئەبو موسا گێڕاویەتیەوە ودەڵێت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی : ( إذا مرض العبد أو سافر كتب الله تعالى له من الأجر مثل ما كان يعمل صحيحا مقيما).

واتە : ئەگەر بەندەی خوا نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد ئەوا خوای پەروەردگار پاداشتی بۆ ئەنوسێ بەئەندازەی ئەو کردەوانەی کە لەکاتی لەش ساغی و پێش سەفەرکردنی ئەنجامی ئەدان.

وەسوڕی مانگانە نەخۆشیەکە ڕێگری دەکات لە خاوەنەکەی لەکردنی ئەو شتانەی کەلەکاتی لەش ساغیدا دەیکات ، جا ئەگەر پێش حەیزەکە هەر نوێژ وعیبادەتێکی کردبێت ئەوا دوای کەوتنە حەیزیشەوە ئەو پاداشتەی بۆ دەنوسرێت.

وەئافرەتان جۆراو جۆرن لەمەدا بەگوێرەی ئیمانەکەیان ، هەندێکیان نوێژیان لەسەر قورسە وکاتێ دەکەونە حەیزەوە دڵخۆش دەبن لەبەر لاچوونی ئەو بارە لەسەر شانیان ، وهەندێکی تریان ودەڵێن ڕۆژانی پشوومان هات ، وەهەندێکی تریان لەم ڕۆژانەدا هەست بەدڵتەنگی وناڕەحەتی دەکەن هاوشێوەی ماسی کەلەئاو دەرهێنراوە.

## چ ڕێگایەک هەیە بۆ نزیک بوونەوە لەخودا لەم ڕۆژانەدا ؟

ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی تاقی کردنەوە و دووریە و پێویستی بەجیهادێکی گەورەی دەروون هەیە ، و با هەوڵ بدەین بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ داڕێژین ، و بەعەزیمەت ونیەت پاکیەوە دەست پێ بکەین ، لەگەڵ ڕازی بوون وتەسلیم بوون ، و دواتر ئارام گرتن وسوپاس وستایشی خوا وسەرقاڵ کردنی دەروون بەجۆرەها تاعەت وعیبادەتەوە.

١- زۆر ئەنجامدانی کاری خێر کەهێندە زۆرن لەئەژمار کردن نایەن...

لەوانە: چاک بوون لەگەڵ دایک وباوک ، وسیلەی ڕەحم هەرچەند بەتەلەفۆنیش بێت ، وخێر وسەدەقە ، وبەجێ هێنانی پێویستی یەکتر ، ولابردنی خەم وخەفەت ، وقسەیەکی خێر وجوان ، وخواردن دان بەهەژار وبێ نەوا ، وبڵاو کردنەوەی عیلم وزانست...

٢- چاوەڕێ کردنی ئەجر وپاداشت لەهەموو کردەوەیەکدا تەنانەت لەکردەوەکانی ماڵ ونوستنیشدا ، موعازی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت : " إني لأحتسب في نومتي كما أحتسب في قومتي.

واتە: من لەنوستنەکەم دا چاوەڕێی پاداشتم هەروەک چۆن لەشەونوێژەکانم دا چاوەڕێی پاداشتم .

٣- لەبەر کردنی ژمارەیەکی دیاری کراو لەفەرموودە یاخود گوێ گرتن لەدەرس یاخود خوێندنەوەی چەند کتێبێکی دیاری کراو ، دڵ پێویستی بەخۆراک هەیە تاوەکو نەخۆش نەکەوێت وئەو خۆراکەی کەبۆی باشە عیلم وزانستە.

٤- سەرقاڵ بوون بەزیکر ویادی خوداوە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) (الرعد:٢٨) .

واتە: وە بزانن کە تەنها بە زیکرو یادی خوای گەورە دڵەکان هێمن و ئارام و ئاسوودە ئەبێت.

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: " أحب الأعمال إلى الله أن تموت ولسانك رطب من ذكر الله " , حسنه الألباني رقم: ١٦٥ في صحيح الجامع

واتە: خۆشەویسترین کردەوە بەلای خوداوە ئەوەیە بمریت وزمانت تەڕ بێت بەزیکری خودا .

وەلەفەرموودەکەی عائیشەدا خوای لێ ڕازی بێت هاتووە ودەڵێت: " كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ". رواه مسلم .

واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زیکر ویادی خودای دەکرد لەهەموو حاڵ وبارێکدا .

٥- دوعا وپاڕانەوە ئەمەیان پێویستی بەدەست نوێژ وپاک بوون نی یە ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: " الدعاء هو العبادة " , صححه الألباني رقم: ٣٤٠٧ في صحيح الجامع .

واتە: دوعا خودی عیبادەت وپەرستشە .

وە دوعا لەسوننەتدا زۆر زۆرە ، لەوانە: دوعا کردن وپاڕانەوە بەناوەجوانەکانی خودا وسیفەتە بەرزەکانی وهێنانە بیری ماناکەی.

٦- شەونوێژ کردن ، هەرکەسێک کاتێکی دیاری کراو هەبێت وپارێزگاری لێ بکات ، کەسانی هەوڵدەر عەزیەت دەکێشن و شەونوێژ دەکەن ولەشەونوێژدا ئیسراحەت دەکەن ،بۆیە هەوڵدە شەونوێژ بکە گەر ماوەیەکی کەمیش بێت بەڵکو خودا لەوانەت ئەژمار بکات کەلەبەرەبەیاندا داوای لێ خۆش بوون دەکەن لەخودا.

لەفەرموودەکەی ئەبو ئومامەدا خوای لێ ڕاز بێت هاتووە ودەڵێت: عەمری کوڕی عەبسە خوای لێ ڕازی بێت بۆی گێڕامەوە کەگوێی لەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو : (أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الرّبّ مِنَ العَبْدِ في جَوْفِ اللّيْلِ الآخِرِ ، فإِنْ اسْتَطَعْتَ أَنْ تكُونَ مِمّنْ يَذْكُرُ الله في تِلْكَ السّاعَةِ فكُنْ (.رواه الترمذي والنسائي..

واتە: نزیکترین کات کە پەروەردگار لە بەندەکەیەوە نزیکە ناوەڕاستی کۆتایی شەوە، ئەگەر توانیت لەو کەسانە بیت کە لەو کاتانەدا زیکری خودا دەکەن ئەوا ببە.

بۆیە هەرکەسێک توانای هەیە لەو سەعاتەدا زیکری خودا بکات بابیکات وکەمتەرخەم نەبێت ، جا دەست نوێژی هەبێت یاخود نا وپاک بێت یاخود لەحەیزدا بێت ؛ چونکە زیکر مەرج نییە بەدەست نوێژ وپاکیەوە بکرێت ، هەرچەند باشتر وایە دەست نوێژی هەبێت وبەتەواوی پاک بێت .

٧- قورئان خوێندن و زۆر گوێگرتن لەقورئان ودەکرێ لەو ماوەیەدا خەتمی قورئان بکات بە خوێندن یان بەگوێگرتن لێی ، جا گەر لەحەیزدایت خۆت بێ بەش مەکە لەقورئان ، و دەتوانیت بیخوێنیت بەڵام بە بێ ئەوەی دەست بدەی لە موصحەفەکە.

٨- لەخشتەیەکی بچووک ئەو کارانەت بنووسە کەلەماوەی حەیزدا ئەنجامت داون لەهەموو مانگێکدا ، بۆ نموونە فڵانە کتێبم خوێندەوە و ئەوەی ترم لەبەر کرد ..لەم ڕێگەیەوە دەتوانی پارێزگاری لەکاتەکانت بکەیت ومەعنەویاتت بەرز بکەیتەوە وچاودێری کردەوەکانت بکەیت .

## چی پێویستە لە سەر ئافرەتان فێری ببن؟

پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ـ پیاو بێت یا خود ئافرەت ـ ئەوەندە لە شەرع شارەزابێت و فێربێت کە بتوانێت خوا پەرستی و هەڵسوکەوت و کاروباری ڕۆژانەی لە گەڵ دەوروبەریدا لە مرۆڤـ و زیندەوەر و دروست کراوەکانی تری خوای پەروەردگار بەشێوازێکی ڕاست و ڕێك وەك چۆن خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕونیان کردوەتەوە ئەنجام بدات .

ئیمامی (الحافظ ابن حجر) لە (فتح الباري)دا فەرموویەتی :

ئەم ووتەیەی خوای گەورە : [وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمًا ﴿١١٤﴾ ] [وە بڵێ پەروەردگارم زانستم زیاتر بکە] : بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر گەورەیی و چاکەی زانست ، چونکە خوای پایە بەرز فەرمانی نەکردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە داوای زیادکردنی هیچ شتێك بکات جگە لە زانست نەبێت .

**وە مەبەست لە زانست:** زانستی شەرعییە کە ئەوە دەگەیەنێت : شارەزابوون لەوەی پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی ئەرك لەسەر **(مُكلَّف)** لەبواری ئاینەکەیدا لە پەرستنەکانیدا و لە هەڵس و کەوتیدا ، و زانیاری دەربارەی خوای گەورە و سیفەتەکانی ، وە ئەوەی کە پێویستە لەپێناو ئەودا پێی هەڵبسێ لە فەرمانەکانی ، و پاك ڕاگرتنی لە کەم و کوڕی ، وە هەموو ئەوانەش ڕاوەستاون لەسەر **تەفسیر و فەرمووده و فقه** .

بەڵام ئافرەتان هەرچەندە جیاوازی نی یە لە نێوان ئەوان و پیاواندا لە (واجب)ـێتی فێربوونی ئەو زانستە گشتیانە کە هاوبەشە لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا ، دەبێت لە هەندێك بـواری تردا کە تایـبەتمـەندە بە ئافرەتان شارەزا و فێـر ببن ، ئەویـش دەتوانـین بەم شێوازەی خـوارەوە ڕوونی بکەینەوە :

## أ- زانستە هاوبەش و گشتی یەکان :

ـ زانستی بیروباوەڕ (العقيدة) و یەکخواپەرستی (التوحيد) بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بپارێزێت لە هاوەڵبڕیاردان و بێ باوەڕی .

ـ پەرستنەکان (العبادات) وە بەتایبەت ئەو پەرستنانەی کە (فرض) و پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ، وەك : چۆنێتی دەست نوێژ و خۆشوشتن (غُسل) و نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج ، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی لەکەم تەرخەمی و بیدعە بپارێزێت .

ـ فێربوونی خوێندنەوەی قورئان و تەفسیر کە ئاسانکار و یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە قورئان

ـ ژیان نامە و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ـ ڕەوشتە بەرز و پیرۆزەکان وەك : ئەدەب و ڕەوشتەکانی هەڵس و کەوت کردن لە گەڵ باوك و دایك و خێزان و گەورە و منداڵ و هاوەڵ و دەرهاوسێ و گیان لەبەرانی تر ، وە ئەدەبەکانی لە ماڵ دەرچوون و هاتنەوە و سەردان و چوون بۆ مزگەوت و دەرچوون لە مزگەوت و ئەدەبی چوونە سەر ئاو و خۆ

پاککردنەوە و دەرچوون لەسەر ئاو و چۆنێتی ئەو جل و بەرگانەی کە لەبەر دەکرێت ... هتد .

## أ- زانستە تایبەتمەندەکان بە ئافرەتان :

ـ حوکمەکانی بێ نوێژی (حَـیـض) و زەیسانی (نِـفـاس) و نەزیفی (إستـحاضـة) .

ـ حوکمەکانی مێرکردن (النکاح) و تەعزیە باری (حِـداد) و پۆشاك (حـجـاب) و خۆرازاندنەوە (الـتزیـن) .

ـ مافەکانی مێرد لەسەر ئافرەت بۆ ئەوەی بە جوانی جێبەجێیان بکات .

ـ ژیاننامەی ئافرەتانی سەلەف بەتایبەت خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ و ئافرەتانی صەحابە .

## * شەرم کردن رێگر نییە لە فێربوونی زانستی شەرعیدا :

ئاشکرایە کە سیفەتی شەرم کردن شتێکی سروشتیە لە ئافرەتدا ، بەڵام زانایانی شەرع پێناسەی شەرم کردن بەوە دەکەن کە :

**شەرم کردن** : ئەو سیفەتە بەرز و پیرۆزەیە کە بەردەوام هاندەرە بۆ دوور کەوتنەوە لە کاری خراپ و نابەجێ و دوور کەوتنەوە لە کەم تەرخەمی لە مافی خاوەن مافەکان.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەچەندین فەرموودەدا باسی شەرم کردنی بەچاکە کردووە و بە یەکێك لە بەشەکانی ئیمانی داناوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((**الْحَيَاءُ كُلُّهُ خَيْرٌ**))

واتە : شەرم کردن هەمووی خەیر و چاکەیە .

وە فەرموویەتی : ((**الْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ**))

واتە : شەرم کردن بەشێکە لە ئیمان .

بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا شەرم کردن نابێتە ڕێگر لە فێربوونی زانستی شەرعی و ئەم ڕاستیە زۆر بەئاشکرا و بەڕاشکاوی رەنگی داوەتەوە لە ژیانی ئافرەتە صەحابیەکان , بۆیە دەبینین عائیشە (رضي اله عنهـا) لە فەرموودەکەیدا وەسفی ئافرەتە ئەنصاریەکان دەکات و دەفەرموێت : ((**نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ ، لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ**))

واتە : باشترین ئافرەت ئافرەتانی ئەنصار بوون ، چونکە شەرم کردن ڕێی لێ نەدەگرتن لە فێربوونی شەرعدا .

وە لە چەندەها فەرموودەدا هاتووە کە ئافرەتان هەوڵیان داوە فێری شەرع ببن و شەرمیان نەکردوە :

دایکی سولەیمی کچی مەلحان کە دایکی ئەنەسی کوڕی مالکە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ووتی : ((**يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحِي مِنَ الْحَقِّ ، فَهَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا احْتَلَمَتْ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ : نَعَمْ إِذَا رَأَتِ**

**الْمَاءَ ، فَغَطَّتْ أُمُّ سَلَمَةَ ـ تَعْنِي وَجْهَهَا ـ وَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ وَتَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ ؟ قَالَ : نَعَمْ تَرِبَتْ يَمِينُكِ ، فَبِمَ يُشْبِهُهَا وَلَدُهَا ؟)).**

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە لە حەق شەرم ناکات ، ئایا ئافرەت خۆشۆردن (غُسل)ی لە سەرە ئەگەر لە خەودا وای بینی لەشی گرانبووە ، پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمووی : بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی ، جا لەوکاتەدا (أم سلمة) لە شەرم کردندا ڕوومەتی خۆی داپۆشی و ووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئافرەت لەخـەودا لەش گــران دەبێت ؟

پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمووی : بەڵێ .

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە دایکی سەلەمە (رضي الله عنها) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی چۆنێتی خۆشوشتنی بۆ نوێژی و خۆشوشتنی لەش گرانی.

وە لە فەرموودەکەی (أسماء)دا ئەویش کە پرسیاری چۆنێتی هەردوو خۆشۆردنەکەی کردووە ، هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ووت : ((... **ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا ، فَقَالَتْ أَسْمَاءُ : وَكَيْفَ تَطَهَّرُ بِهَا ؟ فَقَالَ : سُبْحَانَ اللَّهِ تَطَهَّرِينَ بِهَا ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ : ـ كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ ـ تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ ...))**

واتە : دوای خۆشۆردنی بێ نوێژی پاشان پارچەیەك لۆكە كە میسكی پێوەكرابێ دەهێنێ بۆ ئەوەی خۆی پێ پاك بكاتەوە ، جا (أسماء) ووتی : چۆن خۆی پێ پاك بكاتەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ لە شەرمدا ووتی : ((**سُبْحَانَ اللَّهِ تَطَهَّرِينَ بِهَا**)) جا عائیشە دەفەرموێت ـ وەك چۆن بڵێی ئەوەی ژێر بە ژێر پێی ووت ـ : پارچە لۆكەكە دەهێنیت بەسەر شوێنەواری خوێنەكەدا .

*** ئافرەتان چۆن زانستی شەرعیان بەدەست دەخست لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ؟**

ئافرەتانی سەلەف و بەتایبەت ئافرەتانی صەحابە زۆر سور بوون لەسەر فێربوون و فێركردنی زانستی شەرعی و بەدڵێكی گەرم و زۆر بەپەرۆشەوە ڕوویان دەكردە ئەو جێگایانەی كە زانستی شەرعی تێدا باس دەكرا و بڵاو دەكرایەوە ، وە بەردەوام پرسیاریان دەكرد و بەدوای تەفسیر و واتای ئایەت و فەرمودەكاندا دەگەڕان ، وە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر كارێكیان لێ ئاڵۆز بـبوایە و پێویستی بە زانستێكی زیاتر بكردایە دەیانزانی لە چی جێگایەك ئەو زانستەیان دەست دەكەوێت .

جا ئەگەر ورد بیتەوە لەو ڕێگایانەی کە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەیانگرتەبەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی ، بۆت دەردەکەوێت کە بەم شێوازانەی خوارەوە بووە :

### ١ . ئامادەبوونی جێگا و مەجلیسە تایبەتمەندەکان بە ئافرەتان:

ئەمەش زیاتر لەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئافرەتان داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان بۆ تایبەت بکات بەمەبەستی فێرکردنی ئافرەتان لە زانستی شەرعی و شارەزابوون لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، لە فەرموودەکەیدا هاتووە کە ئافرەتێکی ئەنصاری ووتی بە پێغەمبەر ﷺ: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوان فەرموودەکانی تۆیان بردووە و پێش ئێمە کەوتوون ، بۆیە لەلایەن خۆتەوە ڕۆژێکمان بۆ تایبەت بکە بۆ ئەوەی تێیدا ئەوەمان فێر بکەیت کەوا خوا فیری کردوویت ، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : لە فڵانە ڕۆژدا کۆببنەوە لە فڵانە شوێندا [لە ڕیوایەتێکی تردا : جێگای کۆبونەوەتان ماڵی فڵانەکەسە] ، ئەوانیش کۆبوونەوە و پێغەمبەری خوایش ﷺ هات بۆ لایان لەو ماڵەدا و ئەوەی فێر کردن کە خوا فێری کردبوو

### ٢ . ئامادەبوونی جێگا و مەجلیسە گشتیەکان:

وەك ئامادەبوونی ووتاری ڕۆژی هەینی (خطبة الجمعة) و ووتاری هەردوو جەژنی (ڕەمەزان و قوربان) و ووتاری خۆرگیران و ووتاری پێویست بۆ رووداوێکی نائاسایی و ووتاری حەجی ماڵ ئاوایی و ... هتد .

أ / عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أُخْتٍ لِعَمْرَةَ قَالَتْ : أَخَذْتُ [قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ۝١] مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهُوَ يَقْرَأُ بِهَا عَلَى الْمِنْبَرِ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ)).

واتە : سورەتی [قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ]م وەگرت و فێربووم لەدەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا کاتێ ئەو دەیخوێندەوە لەسەر مینبەر لە هەموو جومعەیەکدا .

ب / عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ : خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَضْحًى أَوْ فِطْرٍ إِلَى الْمُصَلَّى ، فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ : يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ ، فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ ، فَقُلْنَ : وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺدەرچوو بۆ نوێژگە (المصلَّى) لە جەژنی قوربانداا یان لە ڕەمەزاندا ، دای بە لای ئافرەتاندا و فەرموی : " ئەی چینی ئافرەتان ماڵ ببەخشن و چاکە بکەن چونکە من بینیم ئێوە زۆرینەی خەڵکی ئاگرن بوون ، ووتیان : بەچی ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : "زۆر لەعنەت دەکەن و چاکەی مێردەکانتان لەبەر چاو نی یە".

*** ڕۆڵی ئافرەتانی سەلەف لە گێڕانەوەی فەرموودەدا :**

ئافرەتانی صەحابە ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان هەبووە لە گواستنەوە و گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺبەتایبەت خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ماڵی هەر یەکێکیان قوتابخانەیەك بوو بۆ فێربوون و فێرکردنی زانستی شەرعی ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت : [ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ ﴿٣٤﴾ ] [سورة الأحزاب] .

واتة : ئەی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بە بیری خۆتانی بخەنەوە ئەوەی لە ماڵەکانتانا دەخوێنرێتەوە لە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ .

* ژمارەی ئەو ئافرەتە صەحابییانەی کە فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە دەگاتە (٢١٦) ئافرەت لە گەڵ هەر نۆ خێزانەکەی پێغەمبەردا ﷺ.

## ئاگادارکردنەوەی ئافرەتان لە تاوان و سەرپێچییەکان

خوای گەورە دانەری یاساکان و سنورەکانە کە بەختەوەری مرۆڤی تێدایە لە دونیا و قیامەتدا ، وەلە پەیوەست بوون بەسنوری خوای گەورە و نەبەزاندنی سەربەرزی و خاوێنی و پاکژی و نەفس بەرزی مرۆڤایەتی تێدایە ، هەروەها بەرزی وپاراستنە لەڕەوشت نزمی و خراپی و ئاشوبی و تاوان .

لەبەر گەورەیی پلە وپایەی ئافرەت لە کۆمەڵگای موسڵماناندا و پاراستنیان لە سەر پێچی یەکان ئاگاداریان دەکەینەوە لە چەند سەرپێچییەك تا خۆیانی لێ بپارێزن وە ئەگەر کەوتونە ناوی یەوە و توشی بوونە ، ئەوا دەست بەجێ وازی لێ بهێنن و تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خوا چونکە خوای گەورە لێخۆشبووە، هەروەها ئاگاداری خوشکانی موسڵمانی بکات و بەرهەڵستی بکات لە کەسێك کە شتێك لەم سەرپێچی یانە جێبەجێ بکات . داواکارین لە خوای گەورە نیەت و وتە و کردەوەکانمان چاك بکات و تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەوبێت.

### سەرپێچی یەکان لە بیروباوەڕدا:

١-چون بۆ لای جادووگەرو فاڵچی و باوەڕکردن پێیان ، بۆنەخۆشی یاخود چاوەزارو  یاخود کردنەوەی سیحر یاخود هەرشتێکی تر ،پێغەمبەر

ﷺ ئاگاداری کردوینەتەوە لەچونەلایان ودەفەرموێت: :هەرکەسێك بچێتە لای فاڵچی وپرسیاری لیَ بکات دەربارەی شتێك ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لیَ وەرناگیرێت، وەدەفەرمووێت : هەر کەسێك بچێتە لای فاڵچییەك و باوەڕی پیَ بکات لەوەی کە دەیڵێت ئەوا کوفری کردووە بەو قورئانەی کە دابەزیوە بۆسەر محمد ﷺ.

٢-خۆ پەیوەست کردن بە ڕۆژێکی دیاری کراوەوە بۆ سەردانی کردنی گۆڕستان وەکو ڕۆژانی پێنج شەممە یاخود ڕۆژانی جەژن ، هەروەها خۆ سازدان و سەفەر کردن بۆ سەر گۆڕ ئەگەر گۆڕ پێغەمبەریش بێت ﷺ چونکە دەفەرموێت: :خوای گەورە لەعنەتی کردووە لەوئافرەتانەی سەردانی گۆڕستانانیان کردووە بەخو ونەریت .

٣- هاوارکردن و لەخۆدان و یەخە دڕاندن لە سەر مردوو.

٤-نارەزایی و بیَ ئارامی هەندیَ لە ئافرەتان لەکاتی توش بوونیان بە کارەساتێك یان بەڵایەك و دوعا کردنیان لە خۆیان

## سەرپێچی یەکان لە پایەکانی ئیسلام

٥- دواخستنی نوێژەکان لە کاتەکانیاندا، بەتایبەتی لەکاتی دەرچون و شەونخونیو دواکەوتن لەنوستن کەدەبێتە هۆی دواخستنی نوێژی بەیانی بۆ پاش خۆرهەڵاتن .

٦- بایەخ نەدان بەدەرکردنی زەکاتی ماڵ و ئەوخشڵ و زێڕەی کەئافرەت هەیەتی و ساڵێکی بەسەردا تێ دەپەڕێت و گەیشتۆتە ئەو سنورەی کەزەکاتی تیدایە .

٧-کەمتەرخەمی و بایەخ نەدانی هەندێ لە ئافرەتان بەهاوسەر و منداڵەکانیان و ئامۆژگاری نەکردنیان ، کاتێك کە کەمتەرخەمی دەکەن لە جێبەجێ کردنیفەرزەکاندا وەئامۆژکاری نەکردنیان وبەرهەڵستی نەکردنیان، وەکو پێشت گوێ خستنی نوێژی جەماعەت لە لایەن هاوسەرەکەی و کوڕەکانییەوە ،وەپشت گوێخستنی کچەکانی کاتێك کەپێ دەگەن لەجێبەجێ کردنی فەرزەکان و ڕۆژوو. وە جگە لەمە، لە پێویستییەکانی تر.

## سەرپێچییەکان لە پۆشاك و خۆداپۆشیندا

٨-پەیوەست نەبون بە پۆشاکی شەرعی داپۆشەری هەموو لەش، لەکاتی دەرچون لەماڵدا هەروەها لە بەرکردنی جل وبەرگی تەسك وتەنك وکورت

٩-شوێن کەوتنی مۆدێل لەجل و بەرگ و قژ بەردانەوەو قژ بڕین و ئامێرەکانی جوانکاری و گرنگی پێ دراوە ئافرەتی یەکان، کە ئەمەش ون کردنی ناسنامەی ئافرەتی موسڵمانی تێدایە وەلاوازی یە بۆ کەسایەتییەکەی.

## سەرپێچییەکان لەماڵ وخێزانداریێتیدا

١٠. ڕەخنەگرتن و بەرەنگای بونی ئافرەت لەهێنانی زیاتر لە ژنێك لە لایەنی پیاوەکەیەوە و دژایەتی کردنی و ڕازی نەبوونی

١١- گوێرایەڵی نەکردنی مێرد و وەڵام دانەوەی بەتوندی وبەرزکردنەوەی دەنگ لە رویداو بەرهەڵستی کردن و دان نەنان بەچاکەو ئیشە جوانەکانیو گلەیی کردنی لێی بەبەردەوامی بەهۆ، یاخود بەبێ هۆ.

١٢- دیاری کردنی وەچەو کەمکردنەوەی مناڵ بوون بەبێ هۆیەکی گرنگ کەدەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئومەتی ئیسلام.

١٣- گرنگی نەدان بە پەروەردەکردنی منداڵ ، پەروەر کردنێکی موسڵمانانەی پاك لە هەموو خراپی و ناشیرینیەکی وەکو ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی لە دایك بوون، هەروەها لەبەر کردنی ئەو جل و بەرگانەی کە وێنەو خاچی پێوەیە، وە فێرکردنی منداڵان بۆ ئامێرەکانی مۆسیقا، وە لە لایەکی ترەوە هان نەدانیان بۆ نوێژەکان لە مزگەوتدا و بۆ قورئان لەبەر کردن و پەیوەست کردنی بیرو بۆچونیان بە ئیسلامەوە.

١٤- پشت گوێ خستنی هەندێ ئافرەتان و گوێ نەدانیان بە بەرێوەبردنی ئیش و کاری ناوماڵ لە پاك و خاوێنی و چێشت لێ نان

،هەروەها پشت گوێ خستنی خۆ ڕازاندنەوە بۆ مێرد و جێ بەجێ نەکردنی مافەکانی .

١٥- داواکردنی تەڵاق لە مێرد بەبێ هیچ هۆیەکی شەرعی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: هەر ئافرەتێك داوای تەلاق لە مێردەکەی بکات بەبێ هیچ هۆیەکی شەرعی ئەوا بۆنی بەهەشت حەرامە لە سەری .

١٦-زۆرکردنی ئافرەت لە مێردەکەی بە کرینی ئەو شتانەی کە لە توانایدا نییە بە تایبەتی ئەو شتانەی کە(کمالیات )ن و زۆر گرنگ نین.

١٧- باس کردنی ژیانی خێزانێتی و پەیوەندی ژن و مێردایەتی خۆیان بۆ خەڵکی و بڵاوکردنەوەی کێشەو ناخۆشی و نهێنی نێوانیان .

١٨-گرتنی ڕۆژوی سوننەت بەبێ ڕێگەپیدانی مێردەکەی ،پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : حەڵاڵ نیی یە بۆ ئافرەت ڕۆژوی سوننەت بگرێت و مێردەکەی لە ماڵەوە بێت مەگەر خۆی ڕێگەی پێ بدات ، یا خود ڕێگە بدات بە هاتنە ژورەوەی خەڵکی ، تەنها بە ڕَێگە پیدانی مێردەکەی نەبێت .

## سەرپێچی یەکان لە ناو ئاهەنگ و بۆنەکان ( المناسبات )

١٩- دواخستنی شووکردن بەهۆی خوێندن و هۆی ترەوە ، تاخۆی لە هاو تەمەنانی خۆی بەجێ دەمێنیت و بە تەنها دەمێنێتەوە

کەسێك نابینێ بچێتە داخوازی لەبەر تەمەن گەورەیی .

٢٠- گرنگی نەدان بە دین و ڕەوشت لەکاتی هەڵبژاردنی هاوسەریدا و بایەخ نەدان پێیان ،پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:( **إذا أتاكم من ترضون خلقه ودينه فأنكحوه، إن لا تفعلوه تكن فتنة في الأرض و فساد كبير...)**

واتە : ئەگەر هەر کەسێك هات بۆ داخوازیتان لە دین و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا شوی پێ بکەن ئەگەر وانەکەن و شتی تر لێك بدەنەوە ئەوا خراپە و ئاشوبێکی زۆر لەسەر زەویدا بڵاودەبێتەوە .

٢١-زیاد ڕەوی کردن لە دانانی مارەییدا .لە فەرموودەدا هاتوە (**خير الصداق أيسره**) واتە: باشترین مارەیی ئەوەیە کە کەمترین و ئاسانتربێت

٢٢-کەوتنە ناو هەندێ داهێنراوی تازە لەم سەردەمەدا وەکو زۆرکردن لە مێردەکەی بۆ لەسەر کردنی شەبقە یاخود نوسینی ناوی مێردەکەی لەسەری ، هەروەها لاسایی کردنەوەی کافران لەلە بەرکردنی جلی سپی درێژ و دەست کێش و گۆرەوی سپی لەکاتی گواستنەوەدا

٢٣-چوونی ئافرەت بۆ ئارایشگا بۆ لابردنی موی لەشی هەتاوای لێ هاتوە کە شوێنی وای دەردەخات کە دروست نی یە بۆ کەس تەماشای بکات جگە لە مێردەکەی .

٢٤-سوربوون لەسەر گێڕانی ئاهەنگی گواستنەوە لە کۆشك و میوانخانەکان و ئامادەکردنی گۆرانی بێژانی ژن و پیاو ،دەنگ بەرزکردنەوە بەگۆرانی و مۆسیقا و هەڵ هەڵە لێدان و سەرف کردنی پارەیەکی زۆر تا دەگاتە سنورێکی زیادەڕەوی و ئیسراف.

٢٥-دانانی بوك و زاوا لە شوێنێکی بەرز لەپێش چاوی کەسانی نامەحرەم لەخزم و کەس وکاری بوك و زاوا و خەڵکی تر و پیرۆزبایی کردن لێ یان بە تەوقەکردن و سەماکردن بۆیان و گرتنی وێنەی فۆتۆگرافی یاخود بە کامێرای ظیدیۆ .

## سەرپێچی یەکان لە دەرچوون لەماڵ و سەفەر و تێکەڵاو بوون

٢٦-بۆن لە خۆدان لە کاتی دەرچوونی لە ماڵ کە پیاوان بۆنی دەکەن ، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: هەر ئافرەتێك بۆن لە خۆی بدات و پاشان لەماڵ دەرچێت و پیاوانی بێگانە بۆنی بکەن ئەوا ئەوا ئافرەتە زیناکەرە .

٢٧-سەرکەوتنی ئافرەت لەگەڵ شۆفێری بێگانە ، بە تەنها و خۆ دانەپۆشین لێیی .

٢٨- زۆر دەرچوون لەماڵ و چون بۆ بازاڕ .

٢٩-تێکەڵاو بوونی بە پیاوانی بێگانە  لە خزم و کەس وکاری ئافرەتەکە یاخود پیاوەکە یاخود جگە لەمان ،و گاڵتەکردن لەگەڵیاندا وتەوقەکردن لەگەڵیاندا و ئاشکراکردنی جوانی خۆی لەپێش چاویان و خۆدانەپۆشین لەلایان.

٣٠- بە ئاسان گرتنی هەندی لە ئافرەتان لە چون بۆ لای پزیشکی پیاو بۆ چارەسەر کردنی و دەرخستنی شوێنی وایان کە دروست نییە پیشان بدرێت بەبێ ئەوپەڕی ناچاری و گرنگی

٣١-سەفەرکردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم ئیتر بەفڕۆکەبێت یان ئۆتۆمبێل بێت یاخود پاپۆر یاخود جگە لەمانە .پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نابێت ئافرەت سەفەر بکات بەبێ مەحرەم .

٣٢-دەرچوونی هەندێ لە ئافرەتان لە ماڵ بۆ ئیش کردن کە دەبێتە هۆی توش بوونی حەرام و پشت گوێ خستنی مێردو منداڵ ، یا خود وازهێنان لە هەندێ لە فەرزەکان و تێکەڵاو بوون

## چەند سەرپێچییەکی گشتی

٣٣- وازهێنان لە فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە و ئامۆژگاری کردن لە ناو ئافرەتاندا .

٣٤ـ ئازاردانی دایك و باوك بەبەرزکردنەوەی دەنگ لەسەروی ئەوانەوە ،یاخود دڵ ئێشانیان و بێزارکردنیان و گوێرایەڵی نەکردنیان .

٣٥- بڵاو بوونەوەی بەڵاکانی زمان لەغەیبەت و دووزمانی و جگە لەمانە

٣٦- گویٚ نەدان بەنەپاراستنی چاو،وەکو بڵێی ی تەنها خوای گەورە فەرمانی بەپیاوان کردووە نەك بەئافرەتان .

٣٧.تەماشاکردنی ئافرەت بۆ ئافرەتی تر و پاشان باسی بکات بۆ مەحرەمێکی خۆی بەبێ مەبەستی ژن هێنان.

٣٨- کردنی هەندێ ئیشی قەدەغە کراو کە دەبێتە هۆی نەفرەتی خوای گەورە لەسەری.

.پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خاڵ دەکوتن بۆ خەڵکی وە لەوانەیش کە خۆیان دەیکوتن هەروەها لەو ئافرەتانەنەی کە برۆ بۆ خەڵکی هەڵ دەگرن و ئەوانەیش کە

خۆیان هەڵی دەگرن، هەروەها لەو ئافرەتانەی کە ددانیان شاش دەکەن بۆ جوانی کەدروست کراوی خوای گەورەی دەگۆڕن

٣٩-بەنەرمی قسەکردن و دەنگ ناسك کردن لەگەڵ پیاوی بێگانەدا ، بەتایبەتی لە تەلەفۆن دا کە دەبێتە هۆی سەرەنج ڕاکێشانی پیاو وەئافرەتانیش دەبنە نێچیرێکی ئاسان بۆ (ئەو گورگانەی کە لەپێستی مرۆڤدان).

٤٠-لە خۆبایی بوون و خۆ بەگەورە زانینی هەندێ لە ئافرەتان جا چ بەهۆی جوانییانەوە دەبێت یاخود بەهۆی لەبەر کردنی جل و بەرگی گران بەهاو زێڕی بەنرخ و دەوڵەمەندی و شتی ترەوە

٤١-بێ ئاگابونیان لە زۆر سونەت و عیبادەت، هەندێ لە ئافرەتان خوا هیدایەتییان بدات نوێژی (**الوتر والضحى**) نازانن وپارێزگاری ناکەن لە سوننەتەکان، وە هەندێکیان نازانن قورئان بخوێننەوە یاخود خۆیان داناپۆشن تەنها لە مانگی ڕەمەزاندا نەبێت .

٤٢-هەندێ لە ئافرەتان خوا هیدایەتیان بدات هەلدەستن بە بۆیاخ کردنی قژی سەریان بەڕەش لەجیاتی خەنە .پێغەمبەرﷺدەفەرمێ :

لە کۆتایی زەماندا کەسانێك پەیدا دەبن قژەکانیان ڕەش دەکەن وەکو سیقەتۆرەی کۆتر، ئەمانە بۆنی بەهەشت ناکەن .

٤٣-سەرپێچیکردنی سوننەتێك لە سوننەتەکانی فیترەت کە بریتی یە لەنینۆك کردن. ئافرەتی وا هەیە نینۆکی درێژ دەکات و پاشان بۆیاخی دەکات کەئەم بۆیاخە نایەڵێت ئاو بگات بەنینۆکی لەکاتی دەست نوێژگرتن دا و دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی دەست نوێژو پاشانیش نویژەکەی .

٤٤- هاوڕێ یەتی کردنی ئافرەتی خراپ کەهانی دەدەن بۆ کەم تەرخەمی کردن لەپەرستن و جێ بەجێ کردنی مەفەکانی خوای گەورە لەسەریو گرنگی نەدان و بەکەم گرتنی پاراستنی ڕێزو ئابڕووی و توش کردنی بەئیشی وا کە سەرەنجامەکەی سوپاس کراو نابێت .



## ئەی خوشکم بیر لە فریشتەی گیان کێشان بکەوە !!

خوشکەکەم بیربکەرەوە ....!!!

چەند دەژی لەم دونیایەدا ، شەست ساڵ ؟ هەشتا ساڵ ، سەد ساڵ ، هەزار ساڵ ، ئەی دواتر ؟!!

دواتر مردن ، پاشان زیندو بوونەوە جا یان بۆ بەهەشتی نەبڕاوە ویاخود بۆ ئاگری بەئێشی دۆزەخ ..

خوشکەکەم..

دڵنیابە لەوەی فریشتەی گیان کێشان هەروەک چۆن ڕۆحی کەسانی تر دەکێشێت بەڕێوەیە بۆ لای تۆش ، وبزانە ژیان هەرچەند درێژیش بێت ئەنجامەکەی بۆ نەمان و لەنێو چوونە ، وژیان هیچ نییە تەنها چەند ساڵێک نەبێت یاخود چەند ڕۆژێک یاخود چەند ساتێک دواتر تەنها دەبیتەوە نەخۆشەویستان ونەماڵ وهاوەڵانت لەگەڵ دەمێننەوە ...

بیر لەخۆت بکەرەوە لەوەی فریشتەی گیان کێشان هاتووەتە لات وڕوحی لەلای پێیەکانتەوە ڕادەکێشێ..

بیر لەتاریکایی نێو گۆڕ بکەوە وهەروەها تەنهایی وتەسکی وناخۆشیەکەی ....!!

بیر لەشێوەی ئەو دوو فریشتەیە بکەوە کەداتدەنیشێنن وپرسیارت لێ دەکەن .

بیر بکەرەوە لاشەت چی لێ دێت دوای مردن ؟ ئیسکەکانت داڕزاون وگۆشتی گیانت بووە بەخۆراکی کرم وحەشەرات ...!!!

پاشان فوو دەکرێت بەسوڕدا ، دەنگێکی گەورەیە لەگۆڕەکەت دێیتە دەر بەپێ خاوسی وڕووت وقوتی چاوەکان ئەبڵەق دەبن وشاخ وکێوەکان دەدرۆخێن وهەموان توشی شڵەژاوی دەبن ..!!

بیر لەزەلیلی وتەنهایت بکەرەوە لەو ڕۆژەدا ، و بیر لەترس ودڵتەنگی وشڵەژاویت بکەوە ، هەموان بێدەنگ وخامۆشن هیچ دەنگێک نابیستیت تەنها چرپە چرپ نەبێت ، دڵەکان پڕ دەبن لەترس ومنداڵی شیرەخۆرە لەدایکی دادەبڕێ وئافرەتی دوو گیان حەملەکەی دادەنێت .

ئا لەو کاتە خۆت بەری دەکەیت لەمنداڵ ودایک وباوک وخێزان وبرا ودۆستەکانت .

بیر لەو حاڵەتە بکەرەوە کەمرۆڤ هەموان لەبیر دەکات وتەنها لەبیری خۆیدایە .

بیر لەو ڕۆژە بکەرەوە کە میزانی کردەوەکان دادەنرێت ونامەی کردەوە دابەش دەکرێت ؟!!!!

بیر لەو ڕۆژە بکەرەوە کەتیایدا پێت دەوترێت: ئادەی بەسەر پردی سیراتدا تێپەڕ ببە .

بیر لەو ڕۆژە بکەوە لەناو هەمواندا بانگت لێ دەکرێت هۆ فڵانی کچی فڵان : وەرە بۆ لای خودا تۆش هەڵدەستی وکەسی تر هەڵناستێت چونکە تۆ داوا کراوی .

بیر لەو لاوازی وترسە زۆرەت بکەرەوە ، ڕادەوەستی لەبەرانبەر پادشای بەحەق ئەو کەسەی کەبانگی دەکردی وتۆ ڕووت تێندەکرد وڕاتدەکرد لێی ، نامەیەک دەدرێتە دەستت و ورد ودرشتتی تێدایە ، دەبێ حاڵت چۆن بێت وبەچ ڕوویەکەوە بەرانبەری ڕاوەستی ؟!

وە وڵامت چی دەبێت کاتێ پەروەردگار دەڵێت: ئەی دروستکراوەکانم بۆ وڵامتان نەدایەوە ؟، بۆ شەرمتان لێم نەدەکرد ؟ ئایا چاک نەبووم لەگەڵتان و نیعمەتم پێ نەبەخشیبون ؟!!!!

خوشکەکەم ..

دەی بۆ ئارام ناگریت لەسەر تاعەت وعیبادەت لەم چەند ڕۆژە کەمەی دونیادا ، بەڵکو سەرکەوتنی گەورە مسۆگەر بکەیت ...!؟

## پەیوەندی ناشەرعی نێوان کوڕان و کچان

## هۆکارەکانی ، شوێنەوارەکانی ، چارەسەرەکانی

خوشکی موسوڵمان گەر لەجوانی ئیسلام ورد بیتەوە ، وەهەروەها لەئامانج وهەدەفەکانی ، ئەوا دەگەیت بەو حەقیقەتەی کەخودای گەورە خێر وفەزڵ وخۆشگوزەرانی دونیا و دوارِۆژی دەوێ لەبەندەکانی ئەوەش لەپەیڕەو کردنی ئاینەکەی .

یەکێک لەگرنگترین ئامانجەکانی ئیسلام: پاراستنی عیرِز وناموسە وناوبانگە ، و لەپشتی ئەم ئامانجە گەورەیەوە کۆمەڵێک حوکمی شەرعی حەشار دراون کەهەموویان ئامانجیان پاراستن وپارێزگاری کردنە لەخێزان ، و نەوە ، وپاککردنەوەی کۆمەڵگا لەشتی بێ نرخ ، ونەخۆشی ، وناپاکی ، و لەپێش هەمووشیانەوە پاراستنی عیرز و ناو و ناوبانگ لە لەکەدارکردن .

وە لەپێناو پاراستنی عیرِز و ناموسدا ئەو ئەحکامانە دەبن بەدوو بەشەوە :

بەشی یەکەم: ڕێگری کردن لەڕوودانی داوێن پیسی بەهەموو جۆرەکانیەوە و گرتنی هەموو ڕێگایەک کەسەردەکێشێت بۆی ، خوای پەروەردگار زینای حەرام کردووە و پێش ئەوەش نەزەر وتەماشا کردنی حەرامیشی حەرام کردووە کەهۆکارێکی سەرەکییە بۆ زینا و داوێن پیسی ،

وفەرمانی کردووە دەنگ نزم بکرێتەوە ، وئافرەت خۆی داپۆشێت وسفور نەبێت وجگە لەم هۆکارانەش کەدەبنە هۆکاری فاحیشە گەورەکە.

بەشی دووەم: زەواج کردن و هاندان بۆ داوێن پاکی و ئاسانکاری کردن بۆ هەرکەسێک کەدەیەوێت داوێن پاک بێت.

وە گەر لەحەقیقەتی " پەیوەندی ناشەرعی" بکۆڵیتەوە بۆت دەردەکەوێت ئەم کارە ڕێگایەکە بۆ لەکەدار کردنی عیرز وشەرەف ، ئەو عیرزەی کە پاراستنی یەکێکە لەئامانجە گەورەکانی شەریعەتی ئیسلام ، و گەر لەبەر ئەوە نەبوایە زۆر لەئەحکامی شەرعی دانەدەنران کەهەموویان خزمەتی پاراستنی عیرز دەکەن . بۆیە تێبفکرە.

جا خراپ بەکارهێنانی مۆبایل و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان هەنگاوێکە لەهەنگاوەکانی شەیتان کەمرۆڤ بەرەو فاحیشەو لەنێو چوون دەبات ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: **((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ )) النور ٢١**

واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە شوێنی هەنگاو و نەخشەو پیلان و ڕێچکەو کردەوەی شەیتان مەکەون ، چونکە هەر کەسێك شوێن هەنگاو و گومان و پیلان و ڕێچکەی شەیتان بکەوێت ئەوا بە دڵنیایی شەیتان فەرمان ئەکات بە بەدڕەوشتی و خراپەکاری و تاوان.

## هۆکارەکانی دروست بونی پەیوەندی ناشەرعی

### یەکەم : نەشارەزایی و نەزانینی بەحوکمی پەیوەندی ناشەرعی:

شاراوە نی یە لای هەموو ئافرەتێکی موسوڵمانی عاقڵ کە حوکمی پەیوەندی ناشەرعی چی یە لەشەرع دا ، ئەو پەیوەندیە ناشەرعیانە یەکێکن لەگەورەترین هۆکاری هێنانی فەساد وبڵاوبوونەوەی فاحیشە وبەدڕەوشتی ؛ چونکە پەیوەندی ناشەرعی جا لە ڕێگەی مۆبایلەوە بێ یان تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان ڕێگە خۆشکەرە بۆ تەنها بوونەوەی کەسانی فاسق لەگەڵ کچانی موسوڵماندا لەهەرکاتێکدا بێت ، وچاودێری مرۆڤی تێپەڕاندووە ، هاوشێوەی دایک وباوک وعامی خەڵک.

خوشکی موسوڵمان گەر تۆ گومانت هەیە لەحەرامیەتی قسەکردن بەمۆبایل لەگەڵ پیاوانی نامەحرەم دا ئەوا لەم ئایەتە پیرۆزە ورد بەرەوە:

((**وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً**)).واتە: وە ئێوە نزیکی زینا مەکەونەوە وە پێشەکیەکانی زینا هەمووی حەرامە ، بەدڵنیایی ئەمە تاوانێکی بێزێنراوە وە خراپترین ڕێگایە لەبەر ئەوەی بەرەو دۆزەختان ئەبات.

خوای پەروەردگار ڕێگری کردووە لەنزیک بوونەوەی زیناش لەترسی توش بوون وتێکەوتنی، و گومانی تێدا نی یە گێچەڵ وگفتو گۆی مۆبایل

ڕێخۆشکاری زینایە ، چونکە سەردەکێشی بۆ قسە وگفتوگۆی ناشەرعی ومەوعید وگەیشتن بەیەک ..هتد ... ".

شاعیر ڕاستی گوتووە کاتێ دەڵێت:

نظرة فابتسامة فسلام * فكلام فموعد فلقاء

واتە: تەماشاکردن دواتر پێکەنین پاشان سەلام ..ئەوجا قسەکردن لەدوای ئەوە مەوعید پاشان گەیشتن بەیەک!

خوشکی خۆم بیری خۆت بێنەوە ، کە پەیوەندی ناشەرعی هیچ کات خێر بەرهەم ناهێنێت ، هەندێ لەئافرەتانی موسوڵمان وا گومانیان دەبرد لەڕێگەی تەلەفۆن و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان زەواج دەکەن ، بەڵام لەڕاستی دا سەرگەردان بوون لەژیاندا.

زەواج ڕێگایەکە بۆ داوێن پاکی وپاراستنی ناموس ، وپەیوەندی تەلەفۆن هۆکارێکە بۆ هەتک کردنی جا ئایا چۆن ئافرەتی عاقڵ شەرەف و ناموسی خۆی وکەس وکاری دەخاتە ئەو مامەڵەیەوە ، بەبیانووی زەواج ، بێگومان ئەمە سەرکێشیەکی دیار وڕوونە وکەسی ژیر پەنای بۆ نابات.

یەکێک لەو کچانەی کەئالودەی ئەم کارە بوو بوو دەڵێت: سەرەتا تەنها پەیوەندیەکی سادە بوو ، دواتر سەری کێشا بۆ بەسەرهاتی خۆشەویستی وەهمی ، ئەو وای تێگەیاندم خۆشمی دەوێت ودێتە داوام ، جا داوای کرد بمبینێت ، و

من ڕەتم کردەوە ، هەڕەشەی قسە دابڕینی وبچڕاندنی پەیوەندی لێ کردم ، منیش لاواز بووم ، وێنەیەکی خۆم لەگەڵ نامەیەکدا بۆ نارد !!

نامە بەدوای نامە بەردەوام بوو ، داوای لێ کردم لەگەڵی دەرچم ، ئەوجا هەڕەشەی لێ کرد بەوەی وێنە ونامەکان ودەنگەکانم بڵاو دەکاتەوە ، منیش لەگەڵی دەرچووم بەنیازی ئەوەی بەزووترین کات بگەڕێمەوە ، گەڕامەوە بەڵام چۆن گەڕانەوەیەک گەڕانەوەی سەرشۆڕی و سەرگەردانی !

پێم گوت با زەواج بکەین ، بەگاڵتە پێکردنەوە پێی گوتم : من زەواج لەگەڵ کەسی داوێن پیس ناکەم ..

بۆیە خوشکان پەند وەرگرن ، و ئاممان بەو قسانە مەخەڵەتێن گوایە زەواجی سەرکەوتوو پێویستە پێشتر پەیوەندی خۆشەویستی هەبووبێت ، هەموو ئەمانە ختوکەی شەیتانی جن ومرۆڤن ، وکەسانی لاواز پەنای بۆ دەبەن وهۆکارێکە بۆ کەوتنە نێو فاحیشەو خراپەکاریەوە .

خۆشەویستی نێوان ژن ومێرد بەویستی خوا دێتە دی هەرچەند پێش زەواج یەکیان نەناسیبێ وگفتو گۆیان نەکردبێت ، پاشان خۆشەوستی لەهەموو سەقافەتێکی کۆن ونوێدا لەسەر بنەمای ڕەوشت بونیاد دەنرێت ، هەرکات ئافرەت خاوەنی دین وڕەوشت بوو ئەوا مێردەکەی بەڵکو هەموو کەس وکاری خۆشیان دەوێت .

بۆیە گوێ مەدە بەوەی هەندێ کەسی داڕوخاو بانگەشەی بۆ دەکەن ودەیچەسپێنن لەتوێژینەوە کۆمەڵایەتی ودەروونیەکانیاندا، تێبفکرە و ورد بەرەوە.

**دووەم : کەمتەرخەمی لەبەکارهێنانی مۆبایلدا :** ئەم هۆکارە تەنانەت هەندێ لە کەسە مولتەزیمەکانیشی گرتۆتەوە ، چونکە تەنها وەڵامدانەوەی وجورئەت کردن لەقسەکردن لەگەڵ کەسانی نامەحرەمدا دوور نییە ئافرەتی موسوڵمان بخاتە داوی کەسانی فاسقەوە ، هەرچەند نیەتیشی چاک بێت ، چونکە ڕەنگە ئەو کەسەی تەلەفۆن دەکات بەقسەی باق وبریق بێخەڵەتێنێت وئیستغلالی بکات بەتایبەت گەر لەو کەسانە بێت کەتوانای جوڵاندنی هەست وسۆزی بەرانبەریان هەیە .

بۆیە خۆشکی موسوڵمان ، ئاگادار بە خۆت توشی ئەم فیتنەیە مەکە گەر زۆر زەڕوڕ نەبوویت ، چونکە ڕەنگە لەگەڵ کەسی یەکەم دا نەخەڵەتێیت وکەسی سێیەم بتخەڵەتێنێت ، بەتایبەت گەر وا پیشان بدات دەیەوێ زەواجت لەگەڵ بکات وبێتە داوات.

چەندان ئافرەتی داوێن پاک وەڵامی پەیوەندیان دایەوە نەک بەمەبەستی گفتو گۆ بەڵکو وەک پەیوەنیەکی ئاسایی بەڵام توشی کەسانی درۆزن بوون ، وبەردەوام بەم شێوەیە لەگەڵی دوان تاوەکو کەوتنە داوەکەوە وکۆتاییەکەی بەگەیشتن بەیەک وئابڕوو چوون هات

یەکێک لەکچەکان دەڵێت: دایکم لەدەرەوەی ماڵ بوو ، وهیچ کەسێک لەماڵەوە نەبوو تەنها خوشکێکم نەبێت کەئەویش نوستبوو ،ومنیش وانەم دەخوێندو موراجەعەم دەکرد ، ولەناکاو جەرەسی مۆبایلەکەم لێی دا ، ومن هەڵم گرد بەمەبەستی گفتو گۆ نا بەڵکو تەنها بۆ ناسینی کەسی قسەکەر ، گوتم ڕەنگە براکەم بێت وڕەنگە باوکم بێت ..کاتێک دەنگی مرۆڤێکی گورگ ئاسایە ، وهەست وسۆزی بردم بەقسە ونەرمی دەربڕینی وسیحری لێکردم ، و وای دەربڕی نیەتی پاکە وخاوەن ڕەوشتە ، وسەرەتا قسەکانی لەبارەی ڕەوشت جوانی پاک داوێنیەوە بوو ، و خۆشەویستیەکی دوور لەکەسانی منداڵ وتازە پێگەیشتوو، داوای لێ دەکردم زەواجی لەگەڵ بکەم ، وبۆیە تێلی بۆ کردووم بەڵکو خۆشەویستی خۆیم بۆدەربڕێت ، هەموو وتەکانی وەک سیحر بوون ونەمزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە ودواتر تەلەفۆنەکەم داخست..

پاشان بۆ جاری دووەم تەلەفۆنی بۆ کردم ، بۆی دەرکەوت کە من ئامادەم بۆ قسەکردن ، منیش وردە وردە لەگەڵی هاوڕا بووم تاوەکو پەیوەندیەکەمان هیچ سنوورێکی نەما لەتەلەفۆنەوە.

وە من جارێکیان گوێم لەقسەکانی دەگرد ئەوەی کە تۆمارم کردبوو تاوەکو گەشت بەدڵم ، وڕەحمی خوا کردی برایەکم گوێی لێ بوو زلـلەیەکی لێدام وئامۆژگاری کردم وهەڕەشەی لێ کردم، تاوەکو بەخۆم هاتمەوە وتەوبەم کردا .

**سێیەم : لاوازی ئیمان :** زۆر جار پەیوەندی ناشەرعی بەهۆی لاوازی ئیمانەوەیە ، بەتایبەت گەر پەیوەندیەکە سەرەتا لەلایەن کچەوە دەست پێ بکات.

گومانی تێدا نی یە پەیوەندی ناشەرعی نێوان کچان وکوڕان هۆکارێکە بۆ لەکەدار کردنی ناموس ، وکەسی ئیمان لاواز نەبێت کەس پەنای بۆ نابات .

**چوارەم : لە هۆکارەکانی پەیوەندی ناشەرعی هاوەڵی خراپە:**

ئەم هۆکارە یەکێکە لەبەربڵاوترین وکاریگەرترین هۆکارەکان، بۆیە پێویستە ئافرەتی موسوڵمان بەئاگا بێت و بزانێت هاوەڵی کێ دەکات ولەگەڵ کێ و چ جۆرە کەسێک هەڵسوکەوت دەکات!!

**پێنجەم: خراپی پەروەردە و ئاڕاستەکردن:**

لەکاتی نەبوونی پەروەردەیەکی چاک وجوان بۆ کچی موسوڵمان ڕەوشتی ناشیرین وعادەتی خراپ زیاد دەبێت لای کچان بەتایبەت لەمەرحەلەی موڕاهیقی دا ، بۆیە زۆر زەرووڕە دایکان وباوکان چاودێری کچەکانیان بکەن بەگشتی وبەتایبەت لەو کاتەی تازە پێدەگەن ، وچاودێریەکی وردیان بکەن نەبادا هاوەڵی کەسانی خراپ بکەن ودونیا و دواڕۆژیان لەدەست بچێت .

## شەشەم: بەرەڵا کردنی چاو ونەپاراستنی:

خوای پەروەردگار باسی پاراستنی داوێنی لەگەڵ پاراستنی چاودا هێناوە ، وفەرموویەتی : (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ) **النور:٣١**.

واتە: وە ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ: با چاوی خۆیان بپۆشن لە تێڕوانینی پیاوانی نامەحرەم ، وە با دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا، وە لەوەی کە کەس نەیبینێت.

بۆیە پاراستنی چاو زۆر گرنگە ، و پێچەوانەکەی گەورەترین هۆکارە بۆ ئەوەی ئافرەت توشی فیتنە وئارەزوو بێت .

خوشکی موسوڵمان پاراستنی چاو تەنها پاراستنی چاو ناگرێتەوە لەپیاوان لەڕێگاو بان وبازاڕەکاندا نا بەڵکو لەتەلەفیزیۆن و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هەموو جێگەکانی تریش دەگرێتەوە.

## حەوتەم: سفوری و دەرچوون بۆ بازاڕ وشوێنە گشتیەکان بەبێ پێویستی:

لەبەر ئەوەی سفوری بەڵگەیە لەسەر لاڕێ بوونی کەسەکە وهۆکارێکیشە بۆ ئەوەی پیاوان ئەوانەی نەفس نزمن تەماحیان تێبکەن وهەوڵ بدەن قسەیان لەگەڵ بکەن جا بەهەر ڕێگایە بێت .

بۆیە خوشکی موسوڵمان دەست بگرە بەحیجابەکەتەوە وناموست بپارێزە و مەبە نێچیر بۆ کەسانی هەڵپەرست و بەدفەڕو ئارەزووباز .

وەهەروەها خۆت بەدوور بگرە لەچوون بۆ بازاڕ وئەو جێگایانەی کەشوێنی فیتنەن ، هەر لەبەر ئەمەیە ئیسلام فەرمانی بەئافرەتی موسوڵمان کردووە لەماڵەکەیدا ئۆقرە بگرێت ودەرنەچێت مەگەر بۆ زۆر کاری پێویست نەبێت ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی:(( **وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ) الأحزاب:٣٣.**

واتە: وە لە ماڵەکانی خۆتاندا جێگیرو نیشتەجێ بن و بۆ جگە لە پێویستی مەچنە دەرەوە، تەنانەت بۆ نوێژکردنی جومعەو جەماعەت و تەراویح باشتر وایەو خێری زیاترە ئافرەت لە ماڵی خۆی نوێژ بکات و دەرنەچێت ، وە وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی پێشوو جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرمەخەن، (کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین و دەرخستنی جوانی پێشکەوتن نیە بەڵکو پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بووە لە پێش ئیسلامدا) .

### هەشتەم : دەست بەتاڵی:

بێ ئیشی بەتەنها هۆکار نییە بۆ دروست بوونی پەیوەندی ناشەرعی ، نا بەڵکو کاتێ دەست بەتاڵی زیاتر دەبێتە هۆکار کاتێ کەسەکە بێ ئاگا بێت

لەزیکر ویادی خودا وعیبادەت کردن بۆی ، هەرکات ئافرەتی موسوڵمان بێ ئیش بوو وبێ ئاگاش بوو لەخودا ئەوا دەبێتە نێچیرێکی گونجاو بۆ کەسانی ئارەزوو باز وگورگ ئاساکان ، خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە فەرموویەتی :

**(وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً ) الكهف: ٢٨،.**

واتە: وە گوێڕایەڵی ئەو کەسانە مەکە کە دڵیانمان بێئاگا کردووە لە زیکری خۆمان وە شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوونە ، وە کاری ئەوانیش کەمتەرخەمی و فەوتاندن و نەزانی تیایە

لەڕاستی دا دەست بەتاڵی وبێ ئیشی نیعمەتێکی گەورەیە گەر ئافرەتی موسوڵمان بزانێت چۆن بەکاری بێنێت ،و دەبێتە هۆکاری سەر بەرزی وسەرفرازی دونیا ودواڕۆژ ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:

دوو نیعمەت هەن زۆر کەس لێی بێ ئاگان ئەوانیش: لەشساغی ودەست بەتاڵی یە. **البخاري.**

### نۆیەم: دواخستنی زەواج :

ئەمەیان زۆرجار باوکان هۆکارن تیایدا و ئەوە باوکانن کچەکانیان وا لێدەکەن لەگەڵ کوڕاندا بکەوتە گفتوگۆی ناشەرعی ، چونکە کاتێ باوک لەبەر چەند هۆکارێک پوچ کچەکەی زوو نادا بەشوو حەتمەن ئەویش پەنا دەباتە بەر پەیوەندی ناشەرعی گەر خوای گەورە ڕەحمی پێ نەکات.

کچێک دەڵێت: بەڕاستی من لەبارێکی زۆر خراپدام وباوکم سەری بڕیم بەبێ چەقۆ ، سەری بڕیم ئەو ڕۆژەی کە لەبەر موچەو ئەو چەند دینارەی من دەستی دەکەوت ڕێگری لێ کردم شوو بکەم !

ئەم کچە شەیتان دەستی گرت وبردی بەرەو کاری نەشیاو ودەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵ کوڕان وپیاواندا ئەمەش بەهۆی ئەوەی باوکی ڕێگر بوو لەشووکردنی .

بۆیە پێویستە باوکان تەقوای خوایان هەبێت بەرانبەر کچەکانیان ، ودووریان بخەنەوە لەهۆکارەکانی فیتنە بەتایبەت لەم سەردەمەدا کەسەردەمی فیتنەیە وبازاڕی کەسانی خراپ وهیچ وپووچ گەرمە ، و گەر کەسێکی گونجاو وخاوەن دین وڕەوشت هاتە داوای کچەکانتان لێی مەوەستن وبا هیچ بیانویەک هاوشێوەی خوێندن و ..نەبێتە ڕێگر ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: **(إذا جاءکم من ترضون دینه و خلقه فزوجوه).** واتە: ئەگەر پیاوێ دیندارو بەڕەوشت هاتە خوازبێنی کچەکەتان ئەوە بیدەنێ.

وە عبداللەی کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە ودەڵێت : پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: بزانن کە هەمووتان شوانن وهەمووتان بەرپرسن لە ژێردەستەکەی ، ئەو کاربەدەستەی کەلەسەر خەڵکە بەرپرسە لەژێردەستەکانی ، وەپیاو شوانەو بەرپرسە لەماڵ وخێزانەکەی.

## شوێنەوارە خراپەکانی پەیوەندی ناشەرعی لەسەر تاک وکۆمەڵگا

### یەکەم : بڵاوبوونەوەی فاحیشە:

بیانووی پەیوەندی ناشەرعی هەرچیەک بێت ، ئەنجامەکەی داوێن پیسی وخراپەیە ، چونکە پەیوەندی کردن سەردەکێشێت بۆ خەڵوەت ، وهەرکات ئافرەت وپیاوێک لەجێگەیەکدا بەتەنها کۆبوونەوە ئیللا شەیتان سێیەمیانە ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: **"إياكم والدخول على النساء" فقال رجل من الأنصار: يا رسول الله! أفرأيت الحمو؟ قال: "الحمو: الموت " !رواه البخاري،.**

واتە : ( ئاگادارتان ئەکەمەوە لەوەی لە ئافرەتان بەوەی بەتەنها بچنە ژوورەوە ، جا پیاوێک لە ئەنسار گوتی ئەی ئەگەر خزمی مێردی ئافرەتەکە بێ وەک برای مێرد؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى اله وسلم فەرمووی :خزمی مێرد مردنە .

### دووەم : تێکدانی خێزان:

زۆربەی حاڵەتەکانی تەڵاق بەهۆی مۆبایل وتۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوەیە ، و هەندێ کەس لەماڵ نەبوونی مێرد ئیستغلال دەکەن ، بۆیە پێویستە پیاوان زۆر لەماڵ دانەبڕێت وهەرکات سەفەریان کرد زۆریان پێ نەچێت وچاودێری ماڵ ومنداڵیان بکەن.

## چارەسەر چیە؟

لەو چەند خاڵانەی پێشوودا زیانەکانی پەیوەندی ناشەرعی نێوان ئافرەتان وپیاوانی نامەحرەم ڕوون بووەوە ، هەموو ئەمانە وا دەکەن ئافرەتی عاقڵ ڕێکاری خۆ پاراستن لەو دەردە بگرێتە بەر وبەدوای چارەسەرو دەرماندا بگەڕێت گەر خۆشبەختی دنیا و دوارۆژی بوێ.

سەبارەت بە چارەسەر و دوورکەوتنەوە لە پەیوەندی ناشەرعی و تاوان و بە گشتی ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو کە بە گرنگترینیان دەست پێ دەکەین .

**یەکەم: تەقوای خودا وهەست کردن بەچاودێری خودا** ؛ چونکە تەقوای خودا کلیلی هەموو خێرێکە وپارێزەرە لەهەموو شەڕێک ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ((**وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ** ))واتە: وە تەقوای خوای گەورە بکەن ئەوەی کە پێویستتان بێ خوای گەورە فێرتان ئەکات .

جا هەر کەسێک خۆی لەحەرامکراوەکان وهۆکارەکانی بەدوور بگرێت وفەرزەکان جێ بەجێ بکات ئەوا خودا لەهەموو شەڕ وخراپەیەک دەیپارێزێت ، وتەقوای خودا وا لەمرۆڤ دەکات حەیا وشەرمی زیاد بێت ، بێگومان ئەمەش دەرەنجامی باشی دەبێت ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم : **"الحياء خير كله " رواه مسلم .** واتە: شەرم وحەیا هەمووی خێرە .

وشەرم وحەیا ئەساس وبنەمای داوێن پاکی یە .

## دووەم: خۆ پاراست و خۆدوور گرتن لەتاوان :

ئەوەش بەزەواج کردن یاخود بەڕۆژوو بوون دەبێت ، خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە فەرموویەتی: {**ولیستعفف الذین لا یجدون نکاحا حتی یغنیهم الله من فضله** } [**النور: ٣٣**]. واتە: ئەو کەسانەیشی کە توانای هاوسەرگیریان نیە با دامێنی خۆیان بپارێزن و داوێن پاك بن (بەرۆژوو بن) تا خوای گەورە ڕزقیان ئەدات و دەوڵەمەندیان ئەکات بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی و بەهۆیەوە بتوانن هاوسەرگیری بکەن.

وەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی چینی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت، چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەر کردن و قەڵایەکیشە بۆ عەورەت و دەپارێزێت، وە هەر کەس توانای ژن هێنانی نی یە ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی.

جا هەرکات خوشکی موسوڵمان پیاوێکی خاوەن دین وڕەوشت وگونجاو هاتە داوات لێی مەوەستە وزەواج بکە هەرچەند هەژاریش بوو ، چونکە خودا دەوڵەمەندی دەکات وهاریکاری دەکات ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی " **حق علی الله عون من نکح التماس العفاف عما حرم الله.**

واتە:خودا پێویستی کردووە لەسەر خۆی هاریکاری کەسێک بکات کەزەواج بکات بەنیەتی خۆ پاراستن لەو شتانەی خودا حەرامی کردووە.

وەهەروەها فەرموویەتی " **ثلاثة حق على الله تعالى عونهم : المجاهد في سبيل الله والمكاتب الذي يريد الأداء ، والنكاح الذي يريد العفاف** ".

واتە : سێ کەس هەن خوای گەورە بەحەقی داناوە لەسەر خۆی کە یارمەتییان بدات ، کەسێك لەپێناوی خوای گەورەدا جیهاد بکات و کۆیلەیەك دەیەوێت خۆی بکڕێتەوە و خۆی ئازاد بکات و ئەو کەسەی دەیەوێت ژن بهێنێت و مەبەستی داوێن پاکییە.

**سێیەم: هاوەڵی کردنی ئافرەتانی پاک وچاک : چونکە هاوەڵی چاک** باشترین یاریدەدەرە لەسەر خێر وچاکە هەروەک هاوەڵی خراپ بەپێچەوانەوەیە

**چوارەم: دوور بوون لەهۆکارەکانی جوڵاندنی ئارەزوو:**

وەک بەرەڵا کردنی چاو ونەزەری حەرام ، وگوێگرتن لەگۆرانی ، وتەماشا کردنی فلیم ، وخوێندنەوەی چیرۆزە وروژێنەرەکان و ماڵپەڕە بێ ڕەوشتەکان..هتد.

**پێنجەم: سەرقاڵ بوون بەشتە بەسوودەکانەوە :**

چونکە دەست بەتاڵی وبێئاگای ودووری لەخودا مرۆڤ بەرەو هەڵدێر دەبەن ، بۆیە زۆر گرنگە مرۆڤ خۆی سەرقاڵ کات بەشتی بەسوود وزیکر ویادی خوداو قورئان خوێندنەوە ، خوای گەورە فەرموویەتی: **((ألا بذكر الله تطمئن القلوب)) [الرعد: ٢٨]**

واتە: وە بزانن کە تەنها بە زیکرو یادی خوای گەورە دڵەکان هێمن و ئارام و ئاسوودە ئەبێت.

وە لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار پەیمانی داوە بەپاراستنی هەرکەسێک کەسنوورەکانی بپارێزێت .

عبدالله ی کوڕی ئیمامی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێ ڕۆژێکیان لە پشت پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بووم و فەرمووی :

**((يَا غُلاَمُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ : احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ ، احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ ...)) صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٥١٦)**

واتە : ئەی لاوی تازە پێگەیشتوو من چەند وشەیەکت فێر دەکەم : تۆ سنورەکانی شەرعی خوا بپارێزە خواش تۆ دەپارێزێت ، تۆ سنورەکانی شەرعی خوا بپارێزە خوا دەبینیت لە پێشتەوە لەگەڵتدا دەبێت ، ئەگەر داوات کرد ئەوا تەنها داوا لە خوا بـکە ، وە ئەگەر داوای یارمەتیت کرد ئەوا تەنها داوای یارمەتی لە خوا بکە ...

بۆیە خوشکی موسوڵمان لە خوا بترسە و شەرم لە خوای گەورە بکە دڵنیابە ، خوداش لەهەموو شەڕ وخراپەیەک بەدوورت دەگرێت .

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

## سەرەنجامی کچێك

## - کورتە چیرۆکێک بۆ پەند وەرگرتن -

الحمد لله وحده، والصَّلاةُ والسَّلامُ على مَن لا نَبِـيَّ بعدَهُ :

**کچی خەونەکان**

فرمێسکی پەشیمانی بەچاوەکانی دا هاتە خوارێ و گوتی: سەرەتا تەنها پەیوەندیەکی تەلەفۆنی بێ مەبەست بوو ، دواتر سەری کێشا بۆ خۆشەویستیەکی وەهمی ، ئەو وای تێگەیاندم گوایە خۆشی دەوێم ودێتە داوام ، وداوای کرد بمبینێ ، من ڕەتم کردەوە ، هەڕەشەی بچڕاندنی پەیوەندی لێکردم!

منیش لاواز بووم ، خەونی ئەوەم بوو کە بمخوازێت بۆیە پێم خۆش نەبوو پەیوەندیەکە ببچڕێ و وێنەیەکی خۆم لەگەڵ گوڵێک بۆ نارد ، نامە گۆڕینەوە بەردەوام بوو ، دواتر داوای لێکردم لەگەڵی بچمە دەرەوە ، منیش زۆر بەتوندی ڕەتم کردەوە ، بەوێنەکان ونامەکان هەڕەشەی لێکردم ، منیش لەگەڵی دەرچووم بەنیەتی ئەوەی لەزووترین کاتدا بگەڕێمەوە، گەڕامەوە بەڵام چۆن گەڕانەوەیەک ، گەڕامەوە بەڵام بەکۆڵێک غەم وخەفەت وعەیبەوە ، پێم گوت: زەواج ، بەگاڵتە پێکردنێکەوە پێی گوتم: من ئافرەتی فاجر و خراپەکارم ناوێ!..

**خوشکی بەڕێز**

بۆت دەرکەوت سەرەنجامی پەیوەندی حەرام چۆنە؟

بۆیە زۆر ئاگاداربە و وشیار بە و نەکەویتە داوی ئەم جۆرە پەیوەندیانەوە ، و ئاگادار بە نەکەویتە داوی هەندێ هاوڕێی خراپەوە ، وڕاتبکیشێت بۆ ئەم جۆرە پەیوەندیانە ،و بۆت جوان بکات ولەبەر چاوت بیڕازێنێتەوە، وە وا نیشان بدات تۆ توشی ئەو ئابڕو چوونە نابیت کە کەسانی پێش تۆ گیرۆدەی بوون.

ئامان ئامان نەکەی ئەو جۆرە قسانە بەڕاست بزانیت ، هەموو ئەوانە فێڵ وتەڵەکەی شەیتانن ، سەرەنجامی هەموو پەیوەندیەکی حەرام هاوشێوەی ئەم جۆرە لەسەرەنجامەی هەیە بەڵکو ڕەنگە خراپتریش بێت.

وەهەروەها ئاگادار بە نەکەی قسەی ئەو خراپەکار و موجریمانە بەڕاست بزانیت کەیاری بەناموسی خەڵک دەکەن ، ئەوانە کەسانی بەد فەڕ و ناپاکن هەرچەند خۆیان بەئامۆژگاری کار ودڵسۆز پیشان بدەن ، بەڵام بەداخەوە زۆرجار کچان پەند وەرناگرن و هەمان هەڵە دووبارە دەکەنەوە و دەکەونە هەمان داوەوە کە کچانی پێش ئەوان تێی کەوتوون وبەهۆیەوە توشی ئابڕو چوون وپەشیمانی ودەردە سەری دەبنەوە ، بەڵام پەشیمانی چ کاتێک؟

کاتێ کەپەشیمانی دادیان نادات ،دەی بۆ پەند وەرناگرن ؟!

ئەم کچە گەر لەیەکەم هەنگاوەوە عاقڵ و ژیر بوایە نەدەکەوتە داوی ئەو گورگەوە ، بۆیە کچان ئاگادار بن وزۆر هۆشیار بن ، و پەند لەکچانی پێش خۆتان وەرگرن و مەبنە نێچیری کەسانی هەرزە وهیچ وپووچەوە.

**خوشکی بەڕێز**

باوەڕت وا نەبێ کە دەکرێ زەواج لە ڕێگای پەیوەندی تەلەفۆنی و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە بێ ، گەر ڕوش بدات زۆر جار سەرکەوتوو نابێت و فەشەل دێنێ و کۆتایەکەی تەڵاق و جیابوونەوەیە، چونکە هەمیشە ئەو ژن و مێردە لەیەکتر بە گومانن و ترسی ئەوەیان هەیە هەر یەکەیان لەگەڵ کەسی تریش پەیوەندی ناشەرعی ببەستێ و خیانەت لەیەکتر بکەن ، وە هەروەها هەموان دەزانین دونیای سۆشیاڵ میدیا زیاتر وەهمیە تا حەقیقی.

**خوشکی بەڕێز**

گەر خۆشگوزەرانی دونیا و دوا ڕۆژت دەوێت ، و دەتەوێ لەتوڕەیی خودا ڕزگارت بێت ، و بەهەشتەکەی بەدەست بخەیت ، و بەسەر بەرزی بژیت ، گوێ لەم ئامۆژگاریانە بگرە و جێ بەجێی بکە:

**یەکەم** : ئاگاداری پەیوەندی تەلەفۆنی بە ، ئەو پەیوەندیانە تۆمار دەکرێن لە لای خودا ، وە هەروەها مرۆڤە شەیتان ئاکارەکانیش تەسجیلی دەکەن و لەدژت بەکاری دێنن بۆ گوشار خستنە سەرت " ئەوانەی گەبانگەشەی خۆشەویستی دەکەن".

**دووەم** : ئاگاداری تەسویر بە بەهەموو جۆرەکانیەوە ، چونکە بەڕاستی تەسویر ترسناکترین چەکە کە مرۆڤە ئاکار گورگەکان بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکانیان بەکاری دێنن.

**سێیەم** : ئاگاداری نامەی عەشق وغەرامیات بە ، ئەمەش ڕێگایەکە بۆ ڕاو کردن وگوشار خستنە سەر ئافرەتان .

**چوارەم** : ئاگاداری فیلم ودراما فاسدەکان بە ، ئەوانەی کەزۆر جار دەبنە هۆکار بۆ لەخشتە بردنی کچان .

**پێنجەم** : ئاگاداری سفوری وجلی نەشیاو بە، چونکە بەڕاستی سفوری ئافرەت بەڵگەیە لەسەر نەزانی ولاوازی ئیمانی ، ولاوازی کەسایەتی ،وبانگشەشە بۆ فەساد وخراپەکاری ، و دوورە لەڕەوشت و ئاکاری ئیسلامی .

**شەشەم** : پارێزگاری لەحیجابەکەت بکە ، بەڕاستی حیجاب پاکی وسەلامەتیە ، و ڕێزێکە بۆت ، نەک گوشار و ناڕەحەتی بێت بۆت ، هەروەک دوژمنانی ئیسلام ومونافیقان وێنای دەکەن ، وەگەورەترین بەڵگەیە لەسەر باوەڕ و بەرزی ڕەوشتت ، و جیاکەرەوەتە لەگەڵ کەسانی خراپ .

**حەوتەم** : ئاگاداری هەموو جۆرە گوناە و تاوانێک بە ، و هەمیشە هەست بە چاودێری خوای گەورە بکە و شەرم لە خوای گەورە بکە و خۆت لە تاوان بپارێزە چونکە سوێند بەخوا تاوان هۆکارە بۆ ئەوەی توشی ناخۆشی و بەدبەختی ببی لە دونیا و دوارۆژدا .

**لەکۆتایدا**

بیرکەرەوە ـ خوشکی بەڕێز ـ بەم نزیکانە دونیا بەجێ دێڵیت ، و دەبیتە میوانی گۆڕێکی تەنگ و تاریک خۆ ئەگەر توشی تاوانێک بووی ئێستا کات ماوە و پەلە بکە لەتەوبە کردن پێش ئەوەی ببیتە لاشەیەکی بێ گیان و نەتوانی زمانت بجوڵێنی و یەکجار أستغفر الله بکەی ، سوێند بەخوا من ئامۆژگاری کارتم ، و بەزەیم پێتدا دێتەوە.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمين.

## ئایا برۆ کردن حەرامە؟

بسم الله الرحمن الرحيم

برۆ کردن : بە هەموو شێوەیەك حرامە و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان (الكبائر)، ئەمەش چ بە هەڵکێشانی بێت یان بە لـێگرتنی بێت یان بە باریك کردنەوەی بێت یان بە تەنك کردنەوەی بێت یان بە هەر شێواز و جۆرێك بێت حەرامە تەنها لە یەك حاڵەتدا نەبێت ئەویش ئەوەیە: ئەگەر برۆی ئافرەت (تەنانەت هی پیاویش) ئەوەندە دێژ و زۆر بوو کەوا دیمەنی ئاسایی کەسەکە بشێوێنێت و ئازاری دەروونی بدات یان ئەگەر شۆڕببێتەوە بۆ سەر چاوی ئەوا تەنها لەم حاڵەتەدا دروستە ڕێکی بکاتەوە نەك بە مەبەستی جوانکاری و خۆڕازاندنەوە بەڵکو بۆ ڕێك کردنەوە.

ئەمەش بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کەوا (ابن مسعود) دەیگێڕێتەوە و فەرموویەتی:: ((لعن الله الواشمات والمستوشمات والنامصات والمتنمصات والمتفلجات للحسن المغيرات خلق الله)) صحيح مسلم رقم: (٢١٢٥).

واتە: خوا لەعنەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کەوا خاڵادەکوتن و ئەوانەش کە داوادەکەن خاڵیان بۆ بکوترێت، وە لەو ئافرەتانەش کەوا برۆ دەکەن و ئەوانەش کە داوادەکەن برۆیان بۆ بکرێت، وە لەو ئافرەتانەش کەوا بەینی ددانەکانیان دەکەنەوە بۆ جوانکاری و گۆڕان بەسەر دروستکراوی خوادا دێنن.

## من بەتەمام ببم بە باڵاپۆش ئایا تاوانی سفوری پێشترم لای خوای گەورە دەسڕێتەوە؟

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

ئافرەتان لەسەریان واجبە لەشیان داپۆشن و جلی شەرعی لەبەر بکەن ئەمەش دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورە و پاراستن بۆ خۆیان لە چاوی خەڵکانی خراپ و مانەوەیان لەسەر حەیا و پاکی ڕەوشت و بەو کارەیان دەبنە ڕێگرێك لەبەردەم گورگەکانی ڕەوشت خراپی و هەڵناوەرێن لە ژێر دەستیان دا کە پاشانیش هیچ بەهایەکیان بۆ دانانێن جا هەر سفورێك تەوبە بکات و ببێتە باڵاپۆش خوای گەورە تەوبەی لێ وەردەگرێ و تاوانەکانی دەسڕێتەوە وە خوای گەورە وای لێ دەکات کە تاوانی نەبووبێ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ( التائب من الذنب كمن لا ذنب له )صحيح الجامع. واتە: کەسی تەوبەکارو پەشیمان لەتاوان وەکو ئەو کەسەوایە کەتاوانی نییە .

وە ئەو دڵخۆشی و خۆشبەختییەی هەستی پێ دەکەیت ئەو دەرگایە بۆ خۆشبەختی گەورەتر لە دونیا و قیامەتدا إن شاء الله جا خێراکە ساتێك زووتر تەوبە بکەو جلی شەرم و حیشمەت و ڕێز لەبەر بکە نەفرەت بێت لە جلی سفور و نەهێشتنی دین و ڕەوشت.

لە لایەن مامۆستا (خليل أحمد) ە وە وەڵام دراوەتەوە

**ئایا ئافرەتان دەتوانن بچنە حەمام ( گەرماو ) ەوە گشتی یەکانەوە ؟وە حوکمی چوونی بوک بۆ صالۆن و خۆ ڕازاندنەوە بە خەنە چی یە؟**

بەنیسبەت چوون بۆ حەمام دروست نی یە بۆ ئافرەتان ؛ بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەیی پێغەمبەرﷺ کە فەرمویەتی: هەرکەسێک باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە با خێزانەکەی نەبات بۆ حەمام .

وەئەم فەرموودەیە : «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا مِنِ امْرَأَةٍ تَضَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ أَحَدٍ مِنْ أُمَّهَاتِهَا إِلاَّ وَهِيَ هَاتِكَةٌ كُلَّ سِتْرٍ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الرَّحْمَنِ».

واتە : سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، هەر ئافرەتێک جلەکانی لەغەیری ماڵی دایکەکانیدا داکەنێت ئەوا ئەو پەردەیەو سنوورەی کە لە نێوان خۆی و خودادا هەیە هەتک کردووە و بەزاندوویەتی .

وەبەنیسبەت چوونی بۆ صالۆن ، ئەمەش بەهەمان شێوە ڕێگەی پێنادرێت ، چونکە زۆربەی ئەو ئافرەتانەی کاری صالۆن دەکەن یان تێکەڵاوی پیاوان دەبن لەناو سالۆنەکاندا یاخود ئافرەتانێکی مولتەزیم نین ، و پابەند نین بەشەرعەوە ، هەر بۆیە چوون بۆ لایان ئیقرار کردنی کارە خراپەکانیان کەئەنجامی دەدەن، خۆگەر وادابنێین ئەوانە ئافرەتانێکی ڕێک و مولتەزیمن ئەوا دروست نی یە پرچی بەشێوەیەک لێ بکات بشوبهێت بەبێباوەڕان و بەدڕەوشتان ، بەڵام گەر ئافرەتێک پرچەکەی بۆ چاک بکات بەو شێوەیە نەبێت کەباسمان کرد و بۆ مێردەکەی خۆی بڕازێنێتەوە ئەوا دروستە .

## كچ چۆن (مەنی) لەئاوەكانی تر جودا بكاتەوە كاتێک بەخەبەر دێت ؟

پرسیار:

كچ چۆن (مەنی) لەئاوەكانی تر جودا بكاتەوە كاتێک بەخەبەر دێت ، چونكە هەندێ ئاوی كەم لەڕەحمەوە بەردەوام دێن و ڕاناوەستن ، وە ئەگەر كچ لەسوڕی مانگانەدا بوو لەخەودا شتێكی بینی ئایا بەلەشگرانی ئەژمار دەكرێت ؟ وە ئایا دروستە زیكری خودا بكات و قورئان بخوێنێت ؟

**یەكەم :**

لەشگرانی : بریتی یە لە خەو بینین بەشێوەیەک لەو خەودا جماع دەكات ، ئەمە لە پیاوان و ئافرەتانیش ڕوو دەدات ، وە هەندێ جار بەبۆنەی خەو بینینەوە (مەنی) دادەبەزێت ، وە هەندێ جار دانابەزێت ، جا هەر كاتێک (مەنی)دابەزی ئەوا خۆ شوشتن واجب دەبێت ، گەرنا خۆ شوشتن واجب نابێت .

بەڵگەی ئەمەش : ئەو فەرموودیەیە كە ـ أم سلمة رضي الله عنها گێڕاویەتیەوە و دەڵێ : أم سليم هات بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺ و گوتی : (ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، خودا شەرم لەحەق ناكات ، ئایا خۆشوشتن واجب دەبێ لەسەر ئافرەت كاتێ توشی لەش گرانی بوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەمووی : بەڵێ گەر ئاوی بینی ). رواه البخاري (١٣٠)، ومسلم (٧٣٨) .

شێخ البسام دەڵێت : مانای " احتلمت " : " بریتی یە لەوەی کەلەخەودا دەبینرێت ، و مەبەست لێی لێرەدا ئەوەیە : گەر ئافرەت ئەوەی بینی کەپیاوان دەیبینن لەخەودا ، واتە :جماع بکات لەخەویدا .

وە پێویستە لەسەر ئافرەت خۆی بشوات گەر ئەم جۆرە خەوانەی بینی و ئاوی هاتبووەوە ، بەڵام گەر تەنها خەو ببینێت و ئاو نەبینێت ئەوا خۆ شوشتنی لەسەر واجب نابێت ، لەبەر ئەو فەرموودەیەیی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام : ( إذا رأت الماء ) ينظر : "توضيح الأحكام" (١/٢٩٧) . واتە : گەر ئاوی بینی .

**دووەم :**

ئافرەتان ( تەڕای ڕەحم و مەنی ) لەیەک جودا دەکەنەوە بە ناسینی تایبەت مەندیەکانی هەردوو جۆرە ئاوەکە :

(مەنی)ئافرەت دیار و زەردە ، بۆنەکەی وەک بۆنی هەویر وایە ، و لەکاتی دەرچوونیدا هەست بەخۆشی دەکرێت و ئارەزوو دادەمرکێت ، بەپێچەوانەی (تەڕایی ڕەحم) کە کەم و تەنکە ، وجودا کردنەوەی زۆر ئاسانە لەلایەن ئەوئافرەتانەوە کە توشیان بووە .

**سێ یەم :**

گەر ئافرەتێک کەلەسوڕی مانگانەدایە توشی لەش گرانی بوو و ئاوی بینی ، باخۆی بشۆرێت بۆ ئەوەی بتوانێت قورئان بخوێنێت بەبێ ئەوەی دەس

لەقورئانەکە بدات ؛ چونکە بۆ لەش گران دروست نی یە قورئان بخوێنێت بەپێچەوانەی ئافرەتێک کەلەسوڕی مانگانەدایە .

وە ابن قدامة رحمه الله لە "المغني" (١٣٤/١) دا دەڵێت : " گەر خۆی شوشت لەبەر لەش گرانی لەکاتی سوڕی مانگانەدا ، خۆ شوشتنەکەی دروستە ، و ئەو لەش گرانییەی لەسەر لادەچێت . ئەمە قسەی ئیمامی ئەحمەدە و گوتویەتی : لەشگرانیەکەی لەسەر لادەچێت ، وسوڕی مانگانەی دەمێنێ تاوەکو خوێنەکەی نەوەستێتەوە .

وە دەڵێت : من هیچ کەسێک نازانم گوتبێتی خۆی ناشوات تەنها ( عطاء ) نەبێت ، وە ڕیوایەتیش کراوە لێیەوە کە گوتویەتی : خۆی دەشوات .

## حوكمی چونی ئافرەتان بۆ لای پزیشكی پیاوان

چونی ئافرەتان بۆ لای پزیشكی پیاوان دروستە لەكاتی نەبونی پزیشكی ئافرەتاندا هەروەك زانایان باسیان كردووە، هەروەها دروستە لاشە پیشانی پزیشكی پیاوان بدەیت ئەوەندەی كەزەرورە، بەڵام پێویستە مەحرەمی خۆتت لەگەڵدا بێت و تەنها نەبیت لەگەڵ پزیشكدا، چونكە بەتەنها بوون لەگەڵ غەیری مەحرەمی خۆت دروست نیە ئەمەش بۆ پێویستیە، هەروەك چۆن زانایان باسیان كردووە لەكاتی پێویستیدا و بەئەندازەی پێویستییەكەدروستە.

مَجمُوع فَتَاوَى وَرَسَائِل لِلْعُثَيمِين رحمه الله (٢٨٨/١٢).

## دروستە ئافرەت بە تەنها لەگەڵ شۆفێری تەکسی سەربکەویٚ؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ فەرموویەتی : " لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ "

واتە : هیچ پیاوێک لەجێگەیەکدا بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا کۆ نابێتە ئیلا سێیەمیان شەیتانە .

بۆیە دروست نی یە بۆ پیاو لەگەڵ ئافرەتدا و لەیەک جێگایەکدا کۆبێتەوە جا ئەو جێگەیە ماڵ بێت یاخود قوتابخانە بێت یاخود عیادە بێت ویاخود مەسعەد بێت و یاخود سەیارە بێت و جگە لەم جێگایانەش ؛ چونکە ئەوە هۆکارێکە بۆ تووش بوون بەحەرام ومەعلومە کەشەیتان سوورە لەسەر ئەوەی مرۆڤ توشی هەڵدێر وحەڕام بکات و بۆی دەڕازێنێتەوە .

وەزانایان کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە خەڵوەت و کۆ بوونەوە بەتەنها لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم دا حەرامە ، وەدەڵێن : چونکە شەیتان وەسوەسەیان توش دەکات بۆ ئەوەی کاری نەشیاو ئەنجام بدەن . الموسوعة الفقهية ٢٦٧/١٩ ،

جا شۆفێری سەیارە بەدەر نی یە لەوەی بەجێگەیەکدا تێپەڕ ببێت کە کەسیان لێوە دیار نەبێت یاخود بەڕێگایەکی سەریع دا تێپەڕ ببێت ، دواتر سروستی سەیارە وایە زۆربەی لاشەی سەرنشینان دادەپۆشێت ، وهیچ دوور نی یە قسەی حەڕام بەیەکەوە بکەن ، یاخود ڕێک بکەون لەسەر کارێکی حەرام ، و چەندین بەسەر هاتی ئازار بەخش هەیە بەم بۆنەیەوە ڕووی داوە ، جا ئەم شەریعەتە

حەکیمە هەوڵی داوە هەموو ڕێگاکانی گەیشتن بەحەرام و ماڵ وێرانی دابخات ، بۆیە واجبە بەتەواوی دوور کەوینەوە لەهەر شتێک کەدەبێتە هۆکاری خەڵوەت ، وپێویستە سایەقی تەکسی ئافرەت بەتەنها لەگەڵ خۆی هەڵنەگرێت مەگەر لەحاڵەتی زۆر زۆر زەرورەتدا نەبێت وەک ئەوەی توشی ڕووداوێک بوبێت ، والله وليّ التوفيق .

**تێبینی** : ئەم وتانە بۆ ئافرەتانێکە کە بڕوایان بە خوای گەورە و پەیامبەرەکەی هەیە و ڕێنماییەکانی ئیسلام جێ بە جێ دەکەن ، نەک ئەوانەی کە دژی ئیسلام و ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوان ﷺ .

## حوکمی فیلر و بۆتۆکس کردن بۆ ڕوومەت و لێو

ئەوەی کە ئەمڕۆ دەبینرێ لە نێو ئافرەتاندا کە ئەو جۆرە نەشتەرگەریە دەکەن بێ گومان زۆربەی زۆری ئەگەر نەڵێین هەمووی بۆ زیاتر جوانکردنە نەک بۆ لادانی عەیبەیەک ،وە زیاتر چاولێکەری و لاسایی کردنەوەیە ، و پارەیەکی زۆریشی تێدا سەرف دەکرێ ، وە جگە لەوەش وەکو پسپۆڕان دەڵێن زیانی تەندروستیشی هەیە ، بۆیە دەچێتە قاڵبی حەرامەوە مادام بۆ لادانی عەیبەک یان چارەسەری نەخۆشیەک نەبێ، و پێویستە لەسەر ئافرەتان کە لە خوای گەورە بترسن و دوور بکەونەوە لەم جۆرە کارانە .

## ئایا ئەو سیفات و ئاکارانە چین لە ئافرەتاندا کە بە هۆیانەوە خوای گەورە خۆشیانی دەوێ؟

خوشکی موسڵمانم ئەمانەی خوارەوە چەند جۆرە ئافرەتێکن کە هەندێك سیفەت و ئاکاریان تێدایە، بەهۆیانەوە خوای بەرز و بڵند خۆشیانی دەوێت و لێیان ڕازییە، ئەوەش لە ژێر ڕووناکی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەهیوای ئەوەی کە خوشکانمان لەخۆیاندا بەرجەستەی بکەن بۆ ئەوەی ببن بە خۆشەویستی پەروەردگاریان، ئەوانەش:

**ئافرەتی خۆپارێز و لەخوا ترس (المرأة التقية)**

خوای بڵند و باڵادەست فەرموویەتی: [ **إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ** ] واتە: بەڕاستی خوای پەروەردگار کەسانی لە خواترسی خۆشدەوێت.

**ئافرەتی خۆپاکڕاگر لە ڕووکەش و دەروونـدا (المرأة النقية)**

خوای گەورە فەرموویەتی: [ **إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ** ] (البقرة: ٢٢٢)، واتە: خوای پەروەردگار کەسانی تۆبەکار و خۆپاکڕاگرانی خۆش دەوێت.

وە ئەو پاکڕاگریەش پێش هەموو شتێ پاکڕاگرتنی دەروونە لە غەش و حەسوودی و خۆ بەزلزانین و غرور و بەرزبونەوە لە زەویدا، پاشان و دوای ئەوە پاکێتی جەستەیە، چونکە خوای باڵادەست جوانە و جوانیشی خۆشدەوێت.

**ئافرەتی تۆبەکار (المرأة التائبة)**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ** ] (البقرة: ٢٢٢)، واتە: بە ڕاستی خوای پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆلای و هەروەها ئەو کەسانەش کە پاکن.

**ئافرەتی دادوەر (المرأة المقسطة)**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ** ] (الحجرات: ٩)، واتە: دادوەر بن چونکە بەڕاستی خوای پەروەردگار دادوەرانی خۆش ئەوێت.

**ئافرەتی شوێنکەوتوو نەك بیدعەکار (امرأة متبعة غير مبتدعة)**

خوای باڵادەست فەرموویەتی: [ **قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ** ] (آل عمران: ٣١)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن خواتان خۆش دەوێت، دەسا شوێن من بکەون، ئەو کاتە خوای پەروەردگار خۆشتانی دەوێت و لەتاوانەکانتان خۆش دەبێت.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئوممەتی من دەچێتە بەهەشتەوە ئیلا ئەو کەسە نەبێت کە خۆی نەیەوێت !! ووتیان: کێ نایەوێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟!! ئەویش فەرمووی: هەر کەسێك گوێڕایەڵیم بکات ئەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێك سەرپێچیم بکات ئەوە خۆی نەیویستووە.

**ئافرەتی چاکەکار (المرأة المحسنة)**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ** ] (المائدة: ١٣)، واتە: لێیان خۆشبە و چاو پۆشیان لێ بکە چونکە بەڕاستی خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت.

(الإحسان) یش واتە: چاکە کار: ووتەیەکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو کردارێکی جوان و ووتەیەکی چاك و هەڵویستێکی ژیرانەیە.

**ئافرەتی خۆبەکەمزان (المرأة المتواضعة)**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ** ] (المائدة: ٥٤)، واتە: خوای پەروەردگار کەسانێك دەهێنێت کە خۆشیانی دەوێت و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت هەروەها ملکەچ و بە سۆزن بەرامبەر ئیمان داران و سەر بڵند و دەرون بەرزن بەرامبەر بێباوەڕان.

(تواضع) یش خۆ بە کەم زانین ناونیشانی بەرزبوونەوەیە لە دونیا و دوا ڕۆژدا، و هەر بۆ ئەمە یە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: " وما تواضع أحدٌ لله إلا رفعه الله " (رواه مسلم)، واتە: هیچ یەکێك لە بەر خوا خۆی بە کەم نازانێ ئیللا خوای پەروەردگار بەرزی دەکاتەوە.

**ئافرەتی ئارامگر (المرأة الصابرة)**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ** ] (آل عمران: ١٤٦)، واتە: خوای پەروەردگاریش ئارامگر و خۆ ڕاگرانەی خۆش دەوێت.

**ئافرەتی متمانەکـــار و پشت بەستو بـە خـوا (المرأة المتوكلة على الله)**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ] (آل عمران: ١٥٩)، واتە: بە ڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کەپشتی پێ دەبەستن.

لە کۆتاییدا دەڵێم: نازانم ئاخۆ خوشکەکەم بەش و نسیبی تۆ لەم سیفەت و ئاکارانە چیە ؟!

وَآخِرُ دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ



## ئایا ئەو سیفات و ئاکارانە چین لە ئافرەتاندا کە بە هۆیانەوە خوای گەورە خۆشیانی ناوێ و ڕقی لێیانە ؟

ئەمە هەندێك جۆری ئافرەتە کە هەندێك سیفەت و ئاکاریان تێدایە، بەهۆیانەوە خوای گەورە خۆشی ناوێن و ڕقی لێیانە، ئەوەش لە ژێر ڕووناکی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، داوامان وایە لە خوای پەروەردگار کە ئافرەتەکانمان دوور بخاتەوە لە هاوشێوەی ئەمانە، و ئیستیقامەیان لە هەڵسوکەوت و ڕەوشتدا پێ کەرەم کات، ئەوانەش:

* **ئافرەتی بێ باوەڕ (المرأه الكافرة)** : خوای گەورە فەرموویەتی: [ **فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ** ] (آل عمران: ٣٢). واتە: دڵنیا بن کە خوای گەورە بێباوەڕانی خۆش ناوێت.

* **ئافرەتی خراپەکار (المرأة المفسدة):** خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [**وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ** ] (المائدة: ٦٤)، واتە: هەوڵی ئـــەوە دەدەن کە فەســـاد لە سەر زەوی دا بڵاوبکەنـــەوە، خـــوای گەورە مـــوفسیدینی خۆش نـــاوێ بەڵکو زۆر ڕقی لێیانە.

وە لەو شتاتەش کە فەساد و خراپەن: ڕووتی و دەرکەوتنی سفورێتی ئافرەت، یان بانگەواز کردن بۆ ئەم کارە و پشت گوێ خستن و واز هێنان لە بەها ئیسلامییەکان.

وه یەکێکی تر لە فەساد و خراپەکان تەنها بوونەوەی ئافرەتانە لەگەڵ پیاواندا وە تێکەڵ بوونیان بە پیاوانی بێگانە، و هەروەها ئەوەی کە ئافرەتان خۆیان بە پیاوان دەشوبهێنن، یان بە ئافرەتانی بێ باوەڕ و جگە لەمانە.

* **ئافرەتی ستەمکار (المرأة الظالمة) :** خوای پەروەردگار فەرموویەتی: **[فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ]** (الشورى: ٤٠)، واتە: ئەوەی کە لێ بووردە و چاك ساز بوو پاداشتی لای پەروەدگاری خۆیەتی خوای پەروەردگاریش ستەم کارانی خوش ناوێت.

* **ئافرەتی دەست درێژیکار (المرأة المعتدية):** خوای بڵند و باڵادەست فەرموویەتی: [ **وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ** ] (البقرة: ١٩٠)، واتە: نەکەن دەست درێژی بکەن، چونکە بە ڕاستی خوای پەروەردگار دەست درێژ کارانی خۆش ناوێت.

هەر لە دەست درێژ کردنە: جوێن دان بە خەڵکی و ستەم لێ کردنیان و ئازار دانی هاوسێ و جگە لەمانە.

* **ئافرەتی خۆبەزلزان (المرأة المتكبرة) :** خوای گەورە فەرموویەتی: [ **إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا** ] (النساء: ٣٦)، واتە: بە ڕاستی خوای پەروەردگار ئەوانەی خۆشیانی ناوێت کە خۆیان بە زل ئەزانن و فەخر بە سەر خەڵکدا دەکەن.

* **ئافرەتی خیانەتکار (المرأة الخائنة):** خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا** ] (النساء: ١٠٧)، واتە: بە ڕاستی خوای باڵادەست ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خیانەتکار وتاوان بارن.

* **ئافرەتی بەدمەسرەف و زیادڕەویار (المرأة المسرفة) :** خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [ **وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ** ] (الأعراف: ٣١)، واتە: بخۆن و بخۆنەوە بەڵام زیادەڕەوی و بەدمەسرەفی مەکەن چونکە بە ڕاستی خوای پەروەردگار زیادەڕەویکار و بەدمەسرەفی خۆش ناوێت.

لە کۆتاییدا: داواکارم لە پەروەردگاری میهرەبان من و هەموو خوشکانی موسڵمانم لەم سیفەت و ئاکارە خراپ و قێزەونانە بپارێزێت و بەدورگرێت... ئامین.

دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ



## حوکمی دەست نوێژ گرتن لە کاتی هەبوونی مسکارە لەسەر برژانگ

وەڵامی پرسیارەکە بە پوختی:

بێگوومان لەکاتی خۆ شوشتن ودەست نوێژ شوشتندا پێویستە ئاو بگات بەبرژانگی چاو ، لەبەر ئەوەی لەسنووری دەم و چاودایە کە پێویستە بۆ دەست نوێژ بشۆردرێت ، و بەهەمان شێوە مووی برۆ وڕومەت و سمێڵ وڕیش.

سەبارەت بە مسکارە ئەوەندەی پرسیارمان کردبێ بەڵێ مسکارە ڕێگرە لە تەڕبوونی برژانگ و جاری وا هەیە تا دوو بۆ سێ ڕۆژ دەمێنێتەوە و لا ناچێت بە شێوەی سیکۆتین واتە قەبارە و توێکڵی هەیە و تەنها ڕەنگ نیە وەکو خەنە ، بۆیە کەوا بوو ئەو کاتە دەبێ پێش دەست نوێژ یان غوسل لێ بکرێتەوە ، چونکە بۆ دروستێتی دەست نوێژ و غوسل مەرجە ئاو بگاتە پێست و مووەکان ئەمەش کۆ دەنگ زانایانی لەسەرە .



## حوکمی عابا ئەگەر هات و تەسک و نەخشدار بێت

پرسیار:

لەم دواییانەدا عابایەك بڵاوبووەتەوە بەشێوەی لەش دەدورێت و تەسکیشە و لە دوو پارچەی تەنك دروست دەکرێت و دوو دەرباڵ فراوانیش هەیە نەخشی پێوەیە و دەدرێت بەسەر شاندا، جا حوکمی شەرع چییە سەبارەت بەو جۆرە عابایە؟

عابای شەرعی بۆ ئافرەت بریتییە لە (الْجِلْبَابْ) کە بریتییە: لەوەی کە مەبەستی شەرعی پێ جێبەجێ دەبێت لە داپۆشینی تەواو و دوورکەوتنەوە لە فیتنە، لەسەر ئەم وتەیەش پێویستە عابای ئافرەتان ئەم مەرجانەی تێدابێت:

**یەکەم:** دەبێت ئەستووربێت بەشێوەیەك ئەوەی لە ژێریدایە دەری نەخات و بە لەشیشەوە نەلکێت (واتە: سیفەتی لاستیکی تێدانەبێت).

**دووەم:** دەبێت هەموو لەش داپۆشێت و فراوانیشبێت و بەشەکانی لەش دەرنەخات.

**سێیەم** دەبێت تەنها لە پێشەوە کرابێتەوە و دەرباڵەکانیشی تەسك بێت.

**چوارەم:** دەبێت هیچ جۆرە جوانیەکی تێدانەبێت سەرنجی دەوروبەر بۆ خۆی ڕابکێشێت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت دووربێت لە هەموو وێنە وزەخرەفە و نوسین و نیشانەیەك.

**پێنجەم**: دەبێت هاوشێوەی پۆشاکی ئافرەتانی بێباوەڕ نەبێت، یان هاوشێوەی پۆشاکی پیاوان.

**شەشەم**: دەبێت سەرەتاکەی بدرێت بەسەرسەردا نەك شوێنێکی تردا.

لەسەر هەموو ئەو خاڵانەی پێشو ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو عابایەی لە پرسیارەکەدا باسکرا عابایەی شەرعی نیە بۆ ئافرەتان، بۆیە نابێت لەبەربکرێت، چونکە ئەو مەرجانەی تێدانیە کە پێویستە تێیدا هەبێت، هەروەها نابێت هیچ عابایەکی تر لەبەرکرێت کە ئەو مەرجە پێویستیانەی تیادا نەبێت وە ناشبێت وەکو شتومەکی بازرگانی بهێنرێت و دروست بکرێت و بفرۆشرێت و بایەخی پێبدرێت لەناو موسوڵماناندا، چونکە ئەوە بەشداری کردنە لەسەر تاوان و ستەمکردن(١).

فَتَاوَى اللَّجْنَة الْدَائِمَة لِلْبْحوثِ الْعِلْميَّة والإِفتَاء (١٣٩/١٧ - ١٤١).

(١) تێبینییەك: ئەم جۆرە عابایە لە کوردستانی خۆماندا پێی دەوترێت (عابای خەلیجی) وە لە وڵاتانی خەلیجدا پێی دەوترێت: (عابای فەڕەنسی) وە شایەنی بیرخستنەوەیە سەپاندنی ناوی (عابا) بەسەر ئەم جۆرە پۆشاکە سەرنج ڕاکێشو ڕازاوەیەدا کە دەدرێت بەسەر شاندا یەکێکە لە پیلانو فێڵو داوەکانی شەیتانو شوێنکەوتووەکانی بۆ سەرشێواندن لە ئافرەتی موسوڵمانان.

## حوکمی سەفەرکردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم

ئافرەتێك دەڵێت: من دەمەوێت عومرە بکەم لە مانگی ڕەمەزاندا، بەڵام لەگەڵ خوشکەکەم و کچەکەم و مێردی خوشکەکەمدا ئایا دروستە بڕۆم بۆ عومرە لەگەڵیاندا؟

دروست نیە بۆت بڕۆی بۆ عومرە لەگەڵیاندا، چونکە پیاوی خوشکەکەت مەحرەم نیە بۆ تۆ هەروەك پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - دەفەرمووێت: با هیچ ئافرەتێك بەتەنیا کۆنەبێتەوە لەگەڵ پیاوێکدا ئیللا مەحرەمی لەگەڵدابێت، وەهیچ ئافرەتێك با سەفەر نەکات ئیللا مەحرەمی خۆی لەگەڵدابێت. پیاوێك فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - من خێزانەکەم دەرچووە بۆ حەجکردن منیش دەڕۆم بۆ غەزا و جیهادکردن، پێغەمبەری خوایش - صلی الله علیه وسلم - فەرمووی: (بڕۆ حەج لەگەڵ خێزانەکەتدا بکە).

پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - پرسیاری نەکرد ئایا ئەم ئافرەتە ئافرەتی تری لەگەڵدایە یان نا هەروەها پرسیاری نەکرد بلێت ئایە ئەم ئافرەتە پارێزراوە یان نا هەرلەبەر ئەمە ئەگەر ئافرەتێك دواکەوت نەیتوانی عومرە بکات لەبەرئەوەی کە مەحرەمی لەگەڵدا نەبوو ئەوە ئافرەتە تاوانبار نابێت، با پێشتریش عومرەی نەکردبێت، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی حەج و عومرە ئەوەیە کە مەحرەمی خۆی لەگەڵدابێت.

## ئادابـی ئەندامەکانی لەش لەگەڵ خـوشکەکانتدا

**یەکەم**: چـــاو: با تەماشاکردنت بۆ خوشکەکەت سەیرکردنێکی بەبەزەییانەبێت, نەك چاوت لەسەری نەبێت کاتێك ئەو قسەت بۆ دەکات.

**دووەم**: گـــوێ: دەرخستنی گرنگی پێدانت بە قسەی ئەو کەسەی قسەت بۆدەکات, لەگەڵ جوان گوێ بۆ شل کردنت بۆی و قسەپێ نەبڕینی.

**سێ یەم**: زمـــان: قسەکردن لەگەڵ خوشکەکانتدا بە قسەی جوان و چاك, و ئامۆژگاری کردنیان بە خێر وچاکە, لەگەڵ دەنگ بەرزنەکردنەوە بەسەریاندا یاخود باس نەکردنی شتێك کەلێی تێی ناگەن.

**چوارەم**: دەستەکان: دەست واڵاکردنت بۆ خوشکەکانت بەچاکە و سیلەی ڕەحمەوە, و لەبەرانبەردا چاوەڕێ نەکردن لێیان بەوەی پاداشتت بدەنەوە لەسەری.

**پێنجەم**: قاچەکان: بەکارهێنانی لە پێدانی مافی خوشکەکان, وپێش نەکەوتنیان لەکاتی ڕێ کردنتدا بەڵکو لەگەڵیان ڕێ بکە تا ئەندازەی شوێن کەوتن.

**شەشەم**: ناخ و دڵ ودەروون: سنگ فراوانی و دڵ پاکی, خۆشویستن و دڵسۆزی لە ئامۆژگاری و پاکژکردنەوەی دەروونت لە ڕق و کینە وحەسوودی ودژایەتی.

زانیارییەک بۆ هەموو برا و خوشکانمان

(ماڵپەڕی بەهەشت ، ماڵپەڕی وەڵامەکان ، کەناڵی بەکورتی)

لە لایەن یەک ستافەوە بەڕێوە دەبرێت ، لە ژێر چاودێری کۆمەڵێک مامۆستای بەڕێز و شارەزای ئەهلی سوننە ، ئەوەی کە بزانین خێر و چاکە و ئێوەی بەڕێز شارەزا دەکات لە حوکمە شەرعییەکان ئێمە ئامادەی دەکەین و بە کورتی و پوختی دەیخەینە بەردەستی ئێوەی بەڕێز .

تەنها داواکاری ئێمە لە ئێوەی بەڕێز ئەوەیە : بابەتەکانمان بەوردی بخوێننەوە و سودی لێ ببینن و بینێرن بۆ هاوڕێ و کەسانی تر بۆ ئەوەی خەڵکانێکی زیاتر سودمەند بن و ئێوەی بەڕێزیش بەشداربن لە خێرەکەی .

ماڵپەڕی بەهەشت ba٨.org

ماڵپەڕی وەڵامەکان walamakan.com

کەناڵی بەکورتی t.me/ba_kurty

برا و خوشکانی بەڕێز :

ئامۆژگاریتان دەکەین بە دابەزاندنی ( ئەپڵیکەیشنی وەڵامەکان) کە زیاتر لە (٣٥٠٠) پرسیاری وەڵامی شەرعی تێدایە لە هەموو بوارەکانی شەریعەتدا، یەکجار دایبەزێنە و (٣٥٠٠) پرسیار و وەڵامی شەرعی بەبێ ئینتەرنێت بخوێنەوە ، وە بۆ هەردوو سیستەمی ios و android بەردەستە ، ئەتوانن لە ڕێگەی ئەم لینکەوە دایبەزێنن .

http://onelink.to/ekb٦٣b

بۆ زانیاری زیاتر پەیوەندی بکەن بە

٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨

